# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ٢

تەمموزی ٢٠٠٥

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات






- زنجیرەی فێربوونی بەرنامەی MULTIMEDIA BUILDER
- چۆن دەبیتە خاوەن ماڵپەڕێك بەخۆڕایی
- ( نۆف ) خەتمی قورئانی پیرۆز بەدەنگی (١٠) خوێنەر بەقەبارەی تەنها ( ٤ ) مێگابایت .
- چاك كردنەوەو پاك كردنەوەی وێنەشكاوەكان لەفۆتۆشۆپ .



هەولێر ـ ٢٠٠٥



# کۆمپیوتەر




گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت . وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات

ژمارەی ( 2 ) تەمووزی 2005




تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت


ناونیشان
هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیک هۆلی زەرد بۆ هەر پێشنیار و تێبینی و سەرنجێک یان ناردنی بابەتێک پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری بەڕیوبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 4618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

Email : computer_magazine_2005@yahoo.com

Email : aras_co_center@yahoo.com









## بەرنامە 3

- چۆنیەتی دانانی نووسینێکی جوڵاو لە پشتەوەی ڕووبەری شاشە Disktop
-زنجیرەی (١) بۆ فێربوونی بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ .
- چاك کردنەوە و پاك کردنەوەی وێنە شکاوەکان لە فۆتۆشۆپ.
-زنجیرە (١) بۆ فێربوونی بەرنامەی ئەکسێس Microsoft Access 2003
- زنجیرەی (١) بۆ فێربوونی بەرنامەی Fix- it Utilities
- بەرنامەی Cool Edit Pro
- بەرنامەی Nokia Multimedia Player
- چۆن قەبارەی وێنە بچووك دەکەیتەوە؟
- زنجیرەی (١) بۆ فێربوونی بەرنامەی Multimedia Builder

## ئەنتەرنێت 28

- بەرنامەی (نۆف) NOUF
- چۆن دەبیتە خاوەن ماڵپەڕێك بە خۆرایی.
- بەکارهێنانی کامیرای کۆمپیوتەر بۆ چاودێری کردن.
- جیهانی تەکنەلۆژیاو مەترسی لەناو چوونی تۆڕەکانی ئەنتەرنێت.
- ئایا دەتوانرێ سنورێك بۆ تاوانەکانی ئەنتەرنێت دابنرێت.
- لە ساڵی ٢٠٠٨ دا دەتوانی لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە فلیمێکی سینەمایی لە ماوەی چەند چرکەیەك دابەزێنی.
- چینیەکان لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە یادی مردووەکانیان دەکەنەوە.
- مۆدیۆم چییە؟
- دەستگیرکردنی یەکێ لە چەتەکانی ئەنتەرنێت لە تایلاند.
- تایبەتمەندیەکانی ماڵپەری مەکتوب.
- کۆمەڵێك سایتی تایبەت بە دابەزاندنی پێناسەی پارچەکانی ئامێری کۆمپیوتەر.

## زانیاری 44

- چۆنیەتی ڕێگە گرتن لە دزە کردنی چەتەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بۆ ناو ئامێرەکەت.
-پیشاندانی ناو و فێرژنی ویندۆز لەسەر ڕووبەری شاشە Disktop
- وای فای بەرەو کوێمان دەبات؟
- دانانی وێنە لە تایبەتمەندیەکانی My Computer
- زیادکردنی ڕووبەری خەزن کردنی هارد دیسك بۆ دوو بەرامبەر.
- نهێنیەکانی سیستەمی ویندۆز.
- بڵاوبوونەوەی کۆمپیوتەرو فراوان بوونی بواری بەکارهێنانی لە هەرێمی کوردستان.

## هەمەڕەنگ 54

- ئامێری Digital Player USB
-GPRS چیە؟
- ڕێگایەك بۆ کۆگاکردنی ٨٠٠٠ نامە لە نۆکیای ٦٦٠٠
- مۆبایلێکی نوێ دەنگ ئەگوازێتەوە بۆ دەق و ئەینێرێ.
- ململانێی نەتەوەکانی ژاپۆن و چین لە ڕێی ئەنتەرنێت.
- دەزگایەکی نوێ بۆ وەرگێرانی ڕاستەوخۆ بۆ چەند زمانێك.

## دیمانە 61

- عەمار ئازاد محەمەد: دەتوانین لەڕێگای ئەنتەرنێت کورد بە دنیا بناسێنین.

## ڕیپۆرتاژ 62

- سوودو زیانەکانی بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت.







سەرەتا بۆ دانانی نووسینێکی جوڵاو لە پشتەوەی رووبەری شاشەکە DISKTOP دەتوانن نووسینێک لە بەرنامەی فرۆنت پەیج MICROSOFT FRONTPAGE بنووسن وە ئەو نووسینە بە شێوەیەک بجوڵێتەوە

سەرەتا بەرنامەی فرۆنت پەیج بکەرەوە و لە لیستی (ملف) بچۆرە سەر فەرمانی (جدید) و لەوێشەوە بچۆرە سەر فەرمانی (صفحة او ویب) بۆ کردنەوەی پەڕێکی نوێ.
بروانە وێنەی ژمارە (١)
دوای هێنانی پەڕێکی نوێ


وێنەی ژمارە (١)

بچۆرە سەر لیستی (أدراج) لە ناو ئەو لیستدا بچۆرە سەر فەرمانی (مكون ويب) و لەسەر ئەو فەرمانە یەک جار کلیکی لای چەپ بکە دەبینی شێوەیەکت بۆ دەردەکەوێت لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی (نوع المكون) کلیک بکە لەسەر فەرمانی (تأثيرات حيوية) و لە بۆشایی (أختيار التأثير) کلیک بکە لەسەر فەرمانی (شاشة أسمية) ئنجا لە ژێرەوەی شێوەکە کلیک بکە لەسەر فەرمانی (أنهاء).

بروانە وێنەی ژمارە ( ٢ )

دوای ئەوە شێوەیەکی ترتان بۆ دەردەکەوێت لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی سەرەوە نووسینێک بنووسن دەتوانن بە کوردی شتێک بنووسن لە بۆشاییەکە و لە ژێرەوەی شێوەکە لەسەر فەرمانی (نمط) کلیک بکەن دوای ئەوە لەسەر فەرمانی (تنسيق) کلیک بکەن ئنجا لەسەر فەرمانی (خط) ئنجا فۆنتێکی کوردی هەڵبژێرن و کلیک بکەن لەسەر فەرمانی (موافق) ئنجا لە کۆتایی دەتوانن شێوەی جوڵەکە دیاری بکەن کە لە لای راستەوە دەست پێ بکات یان لە لای چەپەوە و هەروەها دەتوانن خێرایی جوڵەکە دەست نیشان بکەن ئنجا کلیک بکەن لەسەر فەرمانی (موافق) بۆ دانانی نووسینە جوڵاوەکە لە ناو پەڕەکە و دەتوانن بۆ جوان کردنی شێوەی پەڕەکە لە لیستی (تنسيق) بچنە سەر فەرمانی (سمة) و شێوەیەک لە

و لەوێش یەک جار کلیکی لای راست دەکەین لیستێکمان بۆ دەردەکەوێ لەو لیستەدا دەچینە سەر فەرمانی PROPERTIES و لەوێ یەک کلیکی لای چەپ دەکەین تا شێوەی DISPLAY PROPERTIES مان بۆ دەردەکەوێ ئنجا لەوێشەوە کلیک دەکەین لەسەر فەرمانی DISKTOP دواتر لە بەشی BROWSE ئەو فایلەی کە پێشتر بە بەرنامەی فرۆنت پەیج دروستمان کردبوو و پارستبومان بە ناوێک دەتوانین بیهێنین وە لێرەدا دایبنین. بڕوانە وێنەی ژمارە (٤).



وێنەی ژمارە (٢)

شێوە ئامادە کراوەکان هەڵبژێرن و پاشان کلیک بکەن لەسەر فەرمانی (موافق) ئنجا لە کۆتاییدا ئەو پەرە بپارێزن (حفظ) ی بکەن بە شێوەی HTML بۆ نموونە لە ناو MY DOCUMENTS بیپارێزن بە ناوێک کە دوایە بتوانن ناوەکە بدۆزنەوە .

بڕوانە وێنەی ژمارە (٣)

دوای ئەوەی کارەکانمان لە بەرنامەی فرۆنت پەیج تەواو دەبێتMICROSOFT FRONTPAGE دەچینە سەر رووبەری شاشەکە DISKTOP



وێنەی ژمارە (٣)



وێنەی ژمارە (٤)



# زنجیرەی (١) بۆ فێربوونی بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ

ئامادەکردنی: فاخر محمود میرزا

ئەم بەرنامە یە بۆ بەکار هێنانی بەرهەمە هونەریەکان بەکاردێت وەک (میکسر، مۆنتاژ، چاکردنی دەنگ ورەنگ) بەشێوەیەکی زۆرئاسان توانای زۆرکاری هونەری تری هەیە وەئێمەش بۆ زانین لەم بەرنامەیە لە چەند زنجیرەیەک باس دەکەین لەم زنجیرەیە باسی (ڕووبەری بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ) دەکەین:

١- بۆ هێنانی ڤیدیۆ

٢- بۆ هێنانی دەنگ

٣- بۆ هێنانی وێنە
٤- بۆ هێنانی تێکست
٥- بۆ هێنانی ڕەنگ
٦- بۆ دیاری کردن
٧- بۆ برینی ڤیدیۆ
٨- بۆ گەورە کردن
٩-بۆ دیاری کردنی چەند ڤیدیۆیەک
١٠- بۆ دیاری کردنی یەک تراک
١١- بۆ مکس کردنی دوو دەنگ
١٢- بۆ هێنانی فلتەری ڤیدیۆ
١٣- بۆ هێنانی فلتەری دەنگ
١٤- بۆ کرۆم کردن
١٥- بۆ هێنانی ئیفێکت (EFFECT)
١٦- بۆ گەورە کردن و بچوک کردنی ڤیدیۆ
١٧- بۆ دانانی ڤیدیۆی (A)
١٨- بۆ دانانی (EFFECT) لە نێوان A و B
١٩- بۆدانانی ڤیدیۆی B
٢٠- بۆ دانانی خەتی کرۆم
٢١- بۆ دانانی دەنگ
٢٢- بەشی (EFFECT)
٢٣- بۆ دەرهێنانی ڤیدیۆیەک دوای تەواو بوونی واتە (ڕێندەر) کردنی کارەکە
٢٤- دانانی فلتەر لە گەڵ زیاد کردنی تراک.



# چاك کردنەوە و پاك کردنەوەی وێنە شکاوەکان لەفۆتۆشۆپ

ئامادەکرنی: عەزیز ئەسعەد



وێنەی ژمارە (١)

بەرنامەی فۆتۆشۆپ کۆمەڵێکی باش لەئامرازەکانی کۆپی کردنی تێدایە، کە وادەکات پاك کردنەوەو چاك کردنەوەی وێنە، شێوەیەکی ئاسان بگرێتە خۆی و هەست بەو گۆڕانکاریانە نەکەیت کەبەسەر وێنەکە دا هاتووە .

ئێمە لەخوارەوە بەشێوەیەکی کورت باسی ئەو ڕێگایانە دەکەین کەبەهۆیەوە دەتوانین وێنە شکاوەکان چاك بکەینەوەو گۆڕانکاری بکەین لەهەر وێنەیەك کەدەمانەوێ .

أ- چاك کردنەوەی بەشێك لەوێنە بەبەکارهێنانی ئامرازی (مۆری کۆپی کردن) (أداة ختم الأستنساخ) CLONE STAMP .

ئەم ئامرازە بەکاردێت بۆ گواستنەوە یا گۆڕینەوەی (پیکسلەکان) لەجێگایەك بۆ جێگایەکی تر لەسەر وێنە، بەهۆی ئەو ڕێگایە دەتوانین ئەو بەشانە لەوێنەکە لادەین کە بونەتە هۆی شێواندن و تێکدانی وێنەکە .

بۆ نموونە دەتوانین ئەو بەشە سەوزاییە بگەڕێنینەوە لەوێنەکە، کەبڕاوە وەك لەوێنەی ژمارە (١) دیارە:

١- لەسەندوقی ئامرازەکان: ئامرازی CLONE STAMP هەڵبژێرە.

٢- لەسەرەوە لەشەریتی تایبەت بەئامرازەکە یەکێك لەفلچەکان هەڵبژێرە، کەوا باشترە قەبارەکەی مام ناوەندی و لێوارەکانی ووردو نەرم بێت .

٣- نیشاندەری ئامرازی (مۆری کۆپی کردن) لەسەر وێنەکە



وێنەی ژمارە (٣)




وێنەی ژمارە (٢)


وێنەی ژمارە (٤)

لەشوێنێک دانی کەنزیک بێت لەشوێنە براوەکە، بۆ ئەوەی بتوانی ئەوبەشەی لێ وەربگریت کەقەرەبووی بەشە شکاوەکە بکات.

دوای ئەوە دەست لەسەر کلیلی (ALT) دابگرەو لەو شوێنە کلیک بکە، دەبینیت شێوەی نیشاندەرەکە دەگۆرێت بۆ کرۆس، بەمەش توانیت بەشێک لەو شوێنە کۆپی بکەیت کەکلیکت لەسەر کردوە، پاشان دەست لەسەر کلیلی (ALT) هەڵبگرە .

٤- دەست بکە بەڕاکێشانی ئامرازی مۆری کۆپی کردن بەسەر شوێنە براوو بزر بووەکە لەوێنەکە.

٥- بەردەوامبە بەم شێوەیە تاکو هەموو شوێنە براوەکە چاک دەکەیتەوە . بەم جۆرە وێنەکی پوخت و جوانت دەست دەکەوێت بەبێ ئەوەی هەست بەهیچ گۆرانکاریەک بکرێ.

ب – چاک کردنەوەی بەشێک لەوێنە بەبەکارهێنانی ئامرازی (مۆری چنین) PATTERN STAMP

١- لەسەندوقی ئامرازەکان ئامرازی دیاری کردن (تحدید) ی لاکێشەیی هەڵبژێرە، بۆ نموونە بەشێک لەو ئاسمانە دیاری بکە وەک لەوێنەی ژمارە (٢) دیارە:

٢- فەرمانی EDIT DEFINE PATTERN هەڵبژێرە ئەم بۆکسەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەو:

ناوێک دیاری بکە بۆ (PATTERN) بۆ نموونە (SKY ) پاشان (OK) بکە.

٣-فەرمانیSELECT DESELECT هەڵبژێرە بۆ لابردنی دیارکردن (تحدید) ەکە .

٤- لەسەندوقی ئامرازەکان ئامرازی (مۆری چنین) هەڵبژێرە کەشاردراوەتەوە لەژێر ئامرازی مۆری کۆپی کردن CLONE STAMP .

٥- لەسەرەوە لەشەریتی تایبەت بەئامرازەکە کلیک لەسەر سێگۆشەی تەنیشت PATTERN بکەو لەو فایل بۆکسەی بۆت دەکرێتەوە (PATTERN) ی (SKY) هەڵبژێرە، کەلەشێوەی وێنەیەکی بچووک یان شێوەی نووسینی


وێنەی ژمارە (٥)

ناوەکە دیارە لەناو فایل بۆکسەکە.
٦- لەسەر وێنەکە . ئامرازی مۆری چنین بەسەر ئەو شوێنەدا بخشێنە کەدەتەوێ بیگۆڕی بۆ نموونە دارەکانی سەرەوەی وێنەکە لەلای چەپ بگۆڕە بەبەشێک لەئاسمانەکە. بەم شێوەیە تاکو هەموو ئەو شوێنە دەگۆڕیت کە لەوێنەکەدا حەز بەگۆڕینی دەکەیت.




وێنەی ژمارە (٦)




وێنەی ژمارە (٧)



وێنەی ژمارە (٧)

# زنجیرەی (١) بۆ فێربوونی بەرنامەی ئەکسێس
# Microsoft Access 2003

ئامادەکردنی:
ڕێبوار نوری سعید




وێنەی ژمارە١

بۆ فێربوون و زیاتر ئاشنا بوونی خوێنەری بەڕێز بە شێوەی زنجیرە باس لە چۆنیەتی فێربوونی ئەکسێس ٢٠٠٣ دەکەین بە تایبەتی بۆ ئەوانەی کە ئارەزووی فێربوونی ئەم بەرنامەیان هەیە.

## پێشەکی:

مایکرۆسۆفت ئەکسێس بریتیە لە بەرنامە هەرە گرنگەکانی کۆمەڵە پرۆگرامی MICROSOFT OFFICE وە تایبەتمەندە بۆ دروست کردنی بنکەی زانیاری بۆ کۆگە کردن و مامەڵە کردن و بەڕێوەبردنی داتاو دۆزینەوەی داتای مەبەست بەخێرایی و ئاسانی هەروەها توانای پرۆگرام کردنی هەیە بە زمانی VISUAL BASIC FOR APPLICATIONS.

بنکەی زانیاری ئەکسێس لە جۆری پەیوەندیدارە، تیایدا داتا لەچەند خشتەکێک کۆگە دەکرێت کە لەوانەیە لەیەک فایلی ئەکسێس یان زیاتر کۆگە بکرێت.

## ئیش پێکردنی ئەکسێس

وەک رۆتینی ئیش کردنی هەموو بەرنامەکانی لە ویندۆز، بۆ کردنەوەو ئیش پێکردنی بەرنامەی ئەکسێس هەمان ڕێگا ئەگرینە بەر بەم شێوەیە:

١- نیشانەی ماوس بگوازەوە بۆ سەر دوگمەی START ئینجا




وێنەی ژمارە ٢

کلیکێک بە دوگمەی لای چەپ ئەوکاتە لیستی START ئەکرێتەوە.

٢- ئینجا نیشانەی ماوس بگوازەرەوە بۆ سەر PROGRAMS دیاری بکەو کەمێک نیشانەی ماوس رابگرە لەسەری ئینجا لیستی پرۆگرامەکان لە تەنیشتیەوە پیشان ئەدات.

٣- نیشانەی ماوس بگوازەرەوە بۆ سەر MICROSOFT OFFICE ئەوکاتە لیستی بەرنامەکانی ئۆفیس پیشان دەدات.

٤- نیشانەی ماوس بگوازرەوە بۆ سەر MICROSOFT ACCESS و یەک کلیک بە دوگمەی لای چەپ بکە.

(وێنەی ژمارە-١)

دوای ئەوە یەکسەر کۆمپیوتەر دەست ئەکات بە ئیش پێکردنی بەرنامەی ئەکسێس وە تاکو چواچێوەی ئەکسێس ئەکرێتەوە وەک لەم وێنەیەدا دیارە.

(وێنەی ژمارە- ٢)

بۆ دەرچـوون لە بەرنامەی ئەکسێس، ئەتوانی یەک لەم رێگایانەی خوارەوە بەکاربێنیت:

١- نیشانەی ماوس بگوازرەوە بۆ سەر دوگمەی X و بە دوگمەی لای چەپ یەک کلیک بکە لەسەری.

(وێنەی ژمارە- ٣)

٢- یان نیشانەی ماوس بگوازرەوە بۆ سەر لیستی FILE و کلیک بکە لەسەری بۆ دەرکەوتن شریتی لیستەکان، ئینجا کۆماندی EXIT هەڵبژێرەو بە دوگمەی لای چەپ یەک کلیک بکە لەسەری.

(وێنەی ژمارە -٤)

٣- یان لە جیاتی ئەو دوو رێگایەی سەرەوە هەردوو دوگمەی ALT + F4 بەیەکەوە دابگرە.

## چوارچێوەی بەرنامەی ئەکسێس و پێکهاتەکەی

چوارچێوەی ئەکسێس لەم بەشانەی خوارەوە پێک دێت.

١- شریتی ناونیشان TITLE BAR کە لە شێوەی شریتێکە ئەکەوێتە بەشی سەرەوەی چوارچێوەکە، لە لای راستیەوە دوگمەیەک بە نیشانەی بەرنامەی ئەکسێس هەیە کە بریتیە لە لیستی کۆنترۆل کردنی چوارچیوەکەو لە لای چەپیشیەوە سێ دوگمەی بچووکی MINIMIZE،MAXIMAZE، CLOSE هەیە. ئەم شریتە ناوی بەرنامەکە ناوی ئەو بنکەی زانیاری کەکراوەیە پیشان دەدات.

٢- شریتی لیستەکان لەشێوەی شریتێکە ئەکەوێتە ژێرەوەی شریتی ناونیشان، ناوی حەوت لیستی لە خۆ دەگرێ ئەوانیش:




وێنەی ژمارە ٣




وێنه‌ی ژماره٤

FILE، EDIT، VIEW، INSERT،) TOOLS، WINDOW، HELP).

(وێنه‌ی ژماره -٥)

٣- شریتی ئامرازه‌کان TOOLS BAR: چه‌ند دوگمه‌یه‌ک له‌خۆی ده‌گرێت که هه‌ریه‌که‌یان بریتیه له لیستێک.

٤- شریتی زانیاری به‌رنامه STATUS BAR: له شێوه‌ی شریتێکه ئه‌که‌وێته ژێره‌وه‌ی چوارچێوه‌ی به‌رنامه‌ی ئه‌کسێس چه‌ند زانیاریه‌ک له‌سه‌ر ئه‌و فایله‌ی که کراوه‌یه پیشان ده‌دات.

٥- لاکێشی ده‌ستپێکردن GETTING STARTED PANE: که چه‌ند به‌ندو لیستێکی له‌سه‌ره کردنه‌وه‌ی بنکه‌ی زانیاری نوێ و پرۆژه‌ی نوێ، گه‌ران به‌دوای زانیاری یارمه‌تیدان له‌سه‌ر بابه‌تێک هه‌روه‌ها چه‌ند لیستێک بۆ کردنه‌وه‌ی بنکه‌ی زانیاری (فایله‌کان) که پێشووتر دروست کرابوون، وه ئه‌م شریته دابه‌ش ئه‌کرێت بۆ چه‌ند به‌شێک که لیسته‌کان تیایدا به پێ تایبه‌تمه‌ندیتی له یه‌ک به‌شدا کۆمه‌ڵ ده‌بن.

٦- به‌شی هه‌ڵگرتنی چوارچێوه‌ی بنکه‌ی زانیاری کراوه که ئه‌که‌وێته نیوان شریتی زانیاری به‌رنامه‌و شریتی ئامرازه‌کان، که پێکهاته‌کانی چوارچێوه‌ی بنکه‌ی زانیاری پیشان ده‌دات وه بریتیه له به‌شه هه‌ره گرنگه‌که‌ی ئه‌کسێس.

### پێکهاته‌ی بنکه‌ی زانیاری:

بنکه‌ی زانیاری ئه‌کسێس له خشته، کوێره‌ی، فۆرم، لاپه‌ره‌ی داتا، ماکرۆ، راپۆرت و مۆدیول پێک دێت، هه‌ریه‌که له‌م به‌شانه کارو فه‌رمانی تایبه‌تی خۆی هه‌یه‌و ته‌واوکه‌ری یه‌کترینه‌و هه‌موویان




وێنه‌ی ژماره ٥

بەیەکەوە بنکەی زانیاری دروست دەکەن. جگە لەم بەشانەی سەرەوە بنکەی زانیاری ئەکسێس چەند خاسیەتێکی تری وەک پەیوەندی نێوان خشتەکان، ڕواڵەتی بنکەی زانیاری، هۆیەکانی وەرگرتن و ناردنی داتا IMPORT/EXPORT DATA لە خۆی دەگرێت کە یارمەتی ئەدات لە ئاسانکردن و بە تواناترکردنی بنکەی زانیاری.

بۆ زیاتر ئاشنابوونی فێرخواز بەبەشەکانی بنکەی زانیاری، لە خوارەوە بەکورتی باسی هەریەک لەبەشەکان دەکەین:

(وێنەی ژمارە- ٦)




وێنەی ژمارە ٦

١- خشتە TABLE:

خاڵی دەستپێکردنە لە بنیاتنانی بنکەی زانیاری ئەکسیس وەئەو شوێنەیە کە داتای تیادا کۆگە دەکرێت ئەگەر داتا لەناو هەمان بنکەی زانیاری بوو وە بە هۆی خشتەکەوە ئەتواندرێت بە ڕێگاری بەستنەوە LINK داتا لە خشتەکی دەرەکی یان لە بنکەیەکی زانیاری تر وەربگیرێت، وە بەشی خشتەک ئەکرێ لەوانەیە لە خشتەیەک یان چەند خشتەیەک پێک بێت، وە بۆی هەیە خشتەیەک بە پەیوەندی ببەسترێتەوە بە خشتەیەکی تر.

لە بنەڕەتدا خشتەش لە چەند کێڵگەیەک پێک دێت کە هەرکێڵگەیەک ناو، جۆری داتاو، فۆرماتی تایبەت بە خۆی دەبێت. چەند کێڵگەیەکیش بەیەکەو یەک ڕیز پێک دێنن کە پێی دەوترێت تۆمار RECORD، وە هەروەها بەباش دەزانرێت کە هەر خشتەیەک یەک کلیلی سەرەتایی هەبێت PRIMARY KEY کە داتا تیایدا دووبارە نابێتەوەو هەر تۆمارێک بە هۆیەوە بەئاسانی ئەناسرێتەوە لە کاتی مامەڵەکردندا.

تێبینی: هەموو بەشەکانی تری بنکەی زانیاری خشتە وەک سەرچاوەی داتا بەکاردەهێنن هەر بۆیە هەموویان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ئەبەسترێنەوە بە خشتەکە.

١- کیوری QUERY:

بریتیە لەو تەنانەی کە بە هۆیەوە ئەتوانیت خشتەکان وەک سەرچاوە بۆ وەرگرتنی داتا بەکاربێنیت بۆ پیشاندانی داتاو هەروەها جێبەجێکردنی گۆڕینی داتا و شیکارکردنی، ڕێگایەکیشە بۆ جێبەجێ کردنی چەند ئەرکێکی وەک هەڵبژاردنی داتاو پرۆسەکردنی چەند پرۆسەیکی ژمێریای و ستاتیکی لەسەر داتا، وەیارمەتی دۆزینەوەی داتا ئەدات بە پێی ئەو حاڵەتەی CRITERIA کە بۆی دیاری دەکرێت ئەمە جگە لەوەی کە ڕێگایەکیشە بۆ زیاد کردنی تۆماری نوێ، هەموارکردنی تۆمارەکان و سڕینەوەی تۆمار بە پێی پێویست. هەروەها ئەتوانرێت وەک ئەڵقەیەک بەکاربێت بۆ هەڵبژاردنی داتاو گەیاندنی بە فۆرم و ڕاپۆرت بۆ مەبەستی پیاچوونەوە یان چاپکردن.

٢- فورم FORM: ڕێگایەکی سەرەکیە بۆ کۆگەکردنی داتا وپیشاندانی داتا، هەروەها بەکاردێت بۆ زیادکردنی تۆمارەکان و پیاچوونەوەی داتاو ڕاستکردنەوەو هەموارکردنی داتاو سڕینەوەی تۆمارەکان، ئەتوانرێت ڕاستەوخۆ داتا لە خشتەکە وەربگرێت یان لە کوێری بۆ ئەم مەبەستەش ئەبەسترێتەوە بە خشتەکە یان کوێری.

٣- لاپەڕەی ئەکسێس ACCESS PAGE: فۆرمێکە بە شێوەی لاپەڕەی INTERNET EXPLORER بەکاردێت بۆ کۆگە کردن و پیشاندان و مامەڵە کردنی داتای بنکەی زانیاری ئەکسێس لە ماڵپەڕی بەرنامەی INTERNET EXPLORER ەوە، بە هۆیەوە ئەرکەکانی زیاد کردنی تۆماری نوێ و پرۆسەی پیاچونەوەی داتاو هەموارکردنی و سڕینەوەی تۆمار ئەنجام بدرێت.

٤- ماکرۆ MACRO: بەکارهێنانی ماکرۆ لە بەرنامەی ئەکسێس وەک بەکارهێنانی ماکرۆی بەرنامەکانی وەک WORD و EXCEL نیەو ناتوانرێت تۆمار بکرێت و بە زمانی VBA نەنووسراوە، بەڵکو بریتیە لە چەند ئەرکێکی ئامادەکراو کە لە بری چەند لیستێک لە ناو لیستەکان و چەند ئەرکێکی تایبەت لەسەر داتاو فۆرمەکان بەکاردێت بۆ لە خۆوە جێبەجێ کردنی پرۆسەیەک لە کاتی ڕووداوێکی دیاریکراودا، بۆ ئەم مەبەستەش ماکرۆ ئەبەسترێتەوە بە کۆنترۆڵەکانی ناو فۆرم وەک BUTTON یان TEXT BOX یان COMBO BOX.. هی تر، بە ڕوودانی ڕووداوێکی دیاریکراوی EVENT وەک (کلیکی ماوس لەسەر دوگمەیەک) ماکرۆکە دەست ئەکا بە ئیشکردن.

٥- ڕاپۆرت REPORT: بەکاردێت بۆ چاپ کردنی ڕاپۆرت ئەمەش مانای ئەوەی داتا ئەگۆڕێت بۆ زانیاری لەسەر کاغەز، وە ئەتوانرێت چەند جۆرێک لە ڕاپۆرت لەسەر داتای خشتەیەک دروست بکرێت بە پێی مەبەست لە ڕاپۆرتەکە.

٦- مۆدیول MODULE: بریتیە لە پێناسەی چەند پرۆسەیەک و فەرمانێک کە بە زمانی VISUAL BASIC نووسراوەتەوە کە لەسەر بەشێک یان کۆنترۆڵێک کاردەکات، لە کاتی بانگ کردنی جێبەجێ دەکرێت.

لە بەرنامەی ئەکسێس دوو جۆر مۆدیول هەیە:

١- STANDARD MODULE: ئەو جۆرە مۆدیولەیە کە ئەرکەکانی SUB و فەرمانەکانی FUNCTION ئەتوانرێت لە پرۆسەکانی تر لە هەموو بەشەکانی بنکەی زانیاری بەکار بێت.

(وێنەی ژمارە- ٧)

٢- CLASS MODULE: ئەو جۆرەیە کە ئەتوانرێت پێناسەی دروست کردنی تەنی نوێی (NEW OBJECT) تێدا بێت و ئەو کردارانەی کە لە ناوی پێناسە دەکرێت دەبن بە PROPERTIES AND METHODS، ئەم جۆرە ئەکرێ بەتەنیا بنووسرێ یان لە گەڵ فۆرم یان لەگەڵ ڕاپۆرتی بێ ئەو کاتە لە گەڵ ئەو فۆرمە یان ڕاپۆرتە کاردەکات،



وێنەی ژمارە ٧

# زنجیرەی (١) بۆ فێربوونی بەرنامەی fix-it utilities کرداری خاوێن کردنەوەی کۆمپیوتەر

باوکی ئاشنا

بەرنامەیەکی زیرەکەو زیاتر لە ٢٠ کرداری کۆمپیوتەری بە ئەنجام دەگەیێنێت کە لە هەمویان گرنگتر گەڕانە بە دوای کێشەکان و چارەسەرکردنیان خاوێن کردنەوەو زانینی PC کۆمپیوتەرو گەڕان بەدوای ڤایرۆس و پاراستنی . لەم زنجیرەیەدا تەنها باسی کرداری پاک کردنەوەی کۆمپیوتەر دەکەین لە ڕێگای بەرنامەی FIX-IT UTILITIES . لە زنجیرەی داهاتوش باس لە کردارە گرنگەکانی تر دەکەین .

دوای دابەزاندنی بەرنامەی FIX-IT UTILITIES کە لەناو کۆمەڵە بەرنامەی عیملاقی (٩) دا هەیە ئینجا دەست دەکەین بەکردنەوەی بەرنامەکەلە فەرمانی دەست پێکردن (START) کلیک دەکەین و دەچینە سەر هەڵبژاردەی بەرنامەکان و (PROGRAMS) لەوێ دەچینە سەر بەشی بەرنامەکە UTILITIES کە لیستێکی لەگەڵە دوایی کلیک لەسەر DISK CLEANER دەکەین بڕوانە وێنەی ژمارە (١)، ئینجا چاوەڕێ دەکەین تا بەرنامەکە دەبێتەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (٢) لە پاشان ئەو بەشە لە هارد دەست نیشان دەکەین کەدەمانەوێ کاری خاوێنکردنەوەی بۆ ئەنجام بدەین لە پاشان کلیک لەسەر NEXT دەکەین وەک لەوێنەی (٢) دا ڕوونکراوەتەوە ئینجا دەچینە هەنگاوی دوای ئەو بڕوانە وێنەی ژمارە (٣) لەم هەنگاوە جۆری ئەو فایلانە دەست نیشان دەکەین کە لە کاتی کردارەکە بسڕێنەوە بۆزیاتر ڕوونکردنەوە بڕوانە وێنەی (٣) پاشان کلیک لەسەر NEXT دەکەین ئینجا چاوەڕێ دەکەین تا تەواوی کۆمپیوتەر دەگەڕێت لەو فایلانەی کە دەستنیشانمان کردون بڕوانە وێنەی ژمارە (٤) دوای دەست



وێنەی ژمارە (١)



وێنەی ژمارە (٢)

Ontrack Fix-It 4.0 Utilities
? Help
X Exit
Disk & Files
DiskCleaner

Check the categories of files to search for. You can customize, create new and delete selected categories. The next step searches for files. After searching is complete, you can choose files to remove.

- Files in Recycle Bin
- Files in Deleted Files Bin
- Backup files - (*.bak, *.old)
- Readme files - (readme.*)
- Zero length files
- Temp files - (*.tmp, *.~*)
- Files unmodified since 1996
- Invalid Shortcuts - (*.lnk that does not point to a valid target)
- Empty folders
- Duplicate files - (Files with matching names and sizes)
- Files greater than 5MB
- ScanDisk broken link files - (*.chk)
- GIFs - (*.gif)

Check all | Uncheck all | Add... | Edit... | Delete

C:\HASAN\PROTOCOL
Stop

وێنەی ژمارە (٣)




وێنەی ژمارە (٤)

نیشانی ئەو فایلانە دەکەین کە مەبەستمانە بیانسڕینەوە و بۆ کۆمپیوتەر هیچ سودێکیان نیە پاشان کلیک لەسەر NEXT دەکەین لەهەنگاوی دواییدا چارەنوسی فایلەکان دیاری دەکەین کە ڕاستەوخۆ بیانسڕینەوە یان بەشێوەی کاتی، بڕوانە وێنەی ژمارە (٥) پاشان کلیک لەسەر NEXT دەکەین ئینجا بەکۆتایی هاتنی ئەم کردارە ڕاپۆرتێکمان دەربارەی ئەم کردارە پێدەدات بڕوانە وێنەی ژمارە( ٦ ) وەدەتوانین ئەم ڕاپۆرتە لای خۆمان بپارێزین ئەویش بەکلیک کردن لەسەر SAVE وەک لەوێنەی (٦) دیارە.

Ontrack Fix-It 4.0 Utilities

? Help | X Exit

Disk & Files | DiskCleaner

Files selected for cleaning can be moved to a folder, placed into a zip archive to save space, moved to the Recycle Bin or permanently deleted. Zipped and moved files can be recovered using Fix-It Undo.

What to do with selected files:

- Delete
- Delete to Recycle Bin
- Zip
- Move

Help | Cancel | Back | Next

وێنەی ژمارە (٥)




وێنەی ژمارە (٦)

# بەرنامەی
# Cool Edit Pro

ئامادەکردنی: کاوە سلیمان

یەکێکە لەو بەرنامە بەرزانەی کەستودیۆکانی جیهان بەگشتی ئەم بەرنامەیە بەکاردەهێنن سوودی لێوەردەگرن بۆکاری تۆمارکردن و دەستکاری کردنی دەنگ و گۆڕینی دەنگ بەهەموو شێوەیەک.

بڕوانە وێنەی ژمارە (١)



وێنەی ژمارە ١

**بەکارهێنانی**

١- پاش کردنەوەی بەرنامەکە دەتوانی لەرێگەی FILE لەوە بچیتە OPEN WAVE FROM .. کلیکی لەسەربکەیت بەم شێوەیە

بڕوانە وێنەی ژمارە (٢)



وێنەی ژمارە ٢

پاشان لیستی نیشاندانی هاردی کۆمپیوتەرەکەت دەردەکەویت بەم شێوەیە:

بڕوانە وێنەی ژمارە (٣)

ئینجا ئەو دەنگەی کەوا دەتەوێ کاری لەسەر بکەیت لەوشوێنەی داتناوە دەیکەیتەوە بە کلیک کردن لەسەر OPEN ئینجا فایلی دەنگەکە دەگوازرێتەوە بۆناو بەرنامەکە.

بڕوانە وێنەی ژمارە (٤)


وێنەی ژمارە ٣


وێنەی ژمارە٤

٢- هەروەها دەتوانی بەرنامەی COOL EDIT PRO بەکاربهێنی بۆ تۆمارکردنی دەنگ لەلای چەپ لەسەرەوە کلیک لەسەرحەرفی (R) دەکەیت و پاشان لەلای چەپ لەخوارەوە کلیک لەسەر هێمای سوور واتا RECORD دەکەیت بەم شێوەیە:

بڕوانە وێنەی ژمارە (٥)

پاش تەواوبوونی کاری پێویست کلیک لەسەر STOP دەکەیت ئینجا لەڕێگای FILE دەچیتە SAVE MIXDOWN AS.. بۆ خەزن کرنی ئەو ئیشەی کردووتە پاش کلیک کردن لەسەری ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو بەم شێوەیە:

بڕوانە وێنەی ژمارە (٦)

ئینجا یەکێک لەبەشەکانی هاردی کۆمپیوتەرەکەت هەڵدەبژێریت و بەناوێک یاخوود بەژمارەیەک خزنی دەکەیت.

بەکارهێنانی بەرنامەی COOL EDIT PRO بۆدەستکاری کردنی دەنگ.

١- لادانی هەوا لەسەر دەنگ ئەم بەشەیان زۆر گرنگە بەتایبەت لەلایەن ئێمە لەبەرئەوەی زۆربەی ئەو گۆرانیانەی یان ئەو ووتارانەی کە کۆن تۆمار کراوون ڕوون نیە یاخود هەوایان زورە بۆدەست کاری کردنی ئەمەش واتا لادانی هەوا لەسەر دەنگ ئەو شوێنەی پێویستتە بەماوس دیاری دەکەیت


وێنەی ژمارە ٥


وێنەی ژمارە٦

بەم شێوەیە:

بڕوانە وێنەی ژمارە (٧)

پاشان لەلای چەپ لەسەرەوە کلیک لەسەر EFFECTS دەکەیت و ئەم لیستە دەبێتەوە ئینجا NOISE REDUCTION هەڵدەبژێریت و پاشان HISS REDUCTION هەڵدەبژێریت ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو.

بڕوانە وێنەی ژمارە (٨)

لەم لیستەدا لەخوارەوە سێ هەڵبژاردنت پێ نیشان دەدات (HI) واتا لادانی دەنگ بەشێوەیەکی بەرز بەتەواوی (MED) واتا لادانی دەنگ بەشێوەیەکی مام ناوەندی (LOW) واتا لادانی دەنگ بەشێوەیەکی نزم دەتوانیت هەرلەم لیستە PREVEIW بەکاربهێنیت بۆئەوەی بزانیت دەنگەکە چۆن دەگۆڕێت پاشان کامەیانت بەدڵ بوو هەڵی دەبژێریت ئینجا کلیک لەسەر OK دەکەیت بەم شێوەیە:

بڕوانە وێنەی ژمارە (٩)

هەروەها ئەگەر هاتوو (HI) یت هەڵبژارد هەوا بەتەواوی نامێنێت لەسەر دەنگەکە بەڵام دەنگەکە زۆر تەپ دەبێت ئەوکاتە دەبێت لەم بەرنامەیە EQUALIZER بەکار بهێنیت بۆ خۆشکردنی دەنگەکە. ئەمەش لەگەڵ چۆن ڕێکلام خستنە سەر گۆرانی بۆزنجیرەی داهاتوو باسی دەکەین . دەتوانم بڵێم ئەم بەرنامەیە زۆربەی ئەو کردارانەی بەسەر دەنگ دادێن لەتوانای داهەیەو ئەنجامی دەدات.



وێنەی ژمارە ٧



وێنەی ژمارە ٨



وێنەی ژمارە ٩




# بەرنامەی Nokia Multimedia Player

ئەم بەرنامەیە توانای بچووک کردنەوەی کلیپی ڤیدیۆ و گۆرانی دەنگ و گۆرانی وێنە هەیە بەشێوەیەکی زۆر بچووک بەشێوەی پێنج جار لەخۆی بچووکتر ئەمەش سوودی لێوەردەگیرێ گۆرانی دەنگ و ڕەنگ بۆسەر مۆبایل و بۆسەر کۆمپیوتەر واتا دەتوانی ژمارەیەکی زۆر لەو کلیپانە بخەیتە سەر مۆبایل یان کۆمپیوتەر، شوێنیش زۆر داگیر ناکات.

**بەکارهێنانی**

١- بەرنامەکەدەکەیتەوە پاشان لەرێگەی FILE دەچیتە OPENبەم شێوەیە:

بڕوانە وێنەی ژمارە (٢)

٢-پاش ئەوەی کلیک لەسەر OPEN دەکەیت ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو:

بڕوانە وێنەی ژمارە (٣)

ئەم پارچە ڤیدیۆیەی پێویستە لەکام بەشی هاردی کۆمپیوتەرەکەت دایە هەڵی دەبژێری کلیکی لەسەر دەکەیت ئینجا کلیک لەسەر OPEN دەکەیت بەم شێوەیە پارچە ڤیدیۆکە یان کلیپەکە دەچێتە ناو بەرنامەکە

٣- بۆئەوەی ئەم پارچە ڤیدیۆیەی کە پێویستە دەتەوێ قەبارەی زۆر بچووک بکەیتەوە بەشێوەیەک کەلەسەر جیهازی مۆبایلەکەت یان کۆمپیوتەرەکەت ژمارەیان زۆربێت و قەبارەشیان کەم بێت دەچیت FILE دەکەیتەوە پاشان



وێنەی ژمارە ٢



وێنەی ژمارە ٣

SAVE PLAELIST کلیک دەکەیت و ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاوت.

بڕوانە وێنەی ژمارە (٤)

لەبۆشایی ژێرەوە ناوێکی یاخود ژمارەیەکی بۆدەنووسیت و پاشان بەشێک لەهاردی کۆمپیوتەرەکەت هەڵدەبژێریت و ئینجا کلیک لەسەر SAVE دەکەیت بەم شێوەیە ئەم کلیپە بچووک دەبێتەوە بەقەبارەیەکی پێنج جار لەخۆی بچووکتر.

بڕوانە وێنەی ژمارە (٥)



وێنەی ژمارە ٤



وێنەی ژمارە ٥

# چۆن قەبارەی وێنە بچووک دەکەیتەوە؟

ئامادەکردنی: قهار بلباس
QAHARBLBAS@YAHOO.COM

زۆرجار دەمانەوێت وێنەیەک بهێنین بۆ ناو سایتەکەمان، یان وێنەیەکی جوان لە کۆمپیوتەر بۆ خۆمان دادەرێژین دەبینین قەبارەی وێنەکە زۆر گەورەترە لەوەی کە ئێمە مەبەستمانە. بۆیە لە هەندێ حاڵەت دوچاری گرفتمان دەکات بە تایبەت بۆ ئەوانەی دیزاینی سایت دەکەن چونکە چەند قەبارەی وێنە بچووکتر بێت ئەوا کردنەوەی سایت خێراترو ئاسانتر دەبێت.

بۆ نموونە ئێمە وێنەیەک لەبەرنامەی MICROSOFTOFFICE PICTURE MANAGER دەکەینەوە دەبینین قەبارەکەی گەورەیە وەکو ئەم وێنەیەی ژمارە (١):

جابۆیە پێویستە چارەیەک بۆ ئەمە بدۆزرێتەوە، ئەم وانەیەش چارەی کێشەکە دەکات زۆر بە ئاسانی:

سەرەتا دەبێت بەرنامەی (JPEG IMAGER 2.1) لەسەر کۆمپیوتەرەکەت دابەزێنیت چونکە ئێمە لەرێگەی ئەو بەرنامەیە کارەکە ئەنجام دەدەین .

لە هەنگاوی یەکەمدا بەرنامەکە دەکەینەوە و کلیک لەسەر نیشانەی OPEN دەکەین، وەک لە وێنەی (٢) دیارە.




وێنەی ژمارە (١)




وێنەی ژمارە (٢)




وێنەی ژمارە (٣)

پاشان پەنجەرەیەکمان بۆ دەبێتەوە تیایدا ئەو شوێنە دیاری دەکەین کە وێنەکەمانی تێدایە و دەبڵ کلیک لەسەر وێنەی مەبەست دەکەین تا بێتە ناو بەرنامەکە، پاشان لە شریتی لیستەکانی بەرنامەکە کلیک لەسەر COMPRESS دەکەین و لیستێکمان بۆ دەبێتەوە لەوێش هەر کلیک لەسەر بەشی COMPRESS دەکەین . سەیری وێنەی ژمارە (٣) بکە:

دوای ئەم هەنگاوە دەبینین بەرنامەکە بۆتە دوو بەش، بەشی لای چەپ وێنەکەی تێدایە بە قەبارەی پێشووی ( واتە بە قەبارەی گەورە)، وە بەشی لای ڕاست وێنەکەی تێدا نیشاندراوە بەڵام بە قەبارە نوێکەی (واتە دوای بچووک بوونەوەی قەبارەکەی) . دەتوانی لە وێنەی ژمارە (٤) تێبینی ئەو گۆڕانە بکەیت کە بە سەر قەبارەی وێنەکەدا هاتووە (سەیری هەردوو نیشانەکە بکە لەسەر وێنەکان) .

ئێستا لە کارەکەمان بووینەوە، بەڵام هێشتا وێنەکەمان سەیڤ (SAVE) نەکردووە، بۆ ئەم مەبەستەش لەشریتی لیستەکانی بەرنامەکە کلیک لەسەر FILE دەکەین و لەناو بەشەکانی ئەم لیستەدا SAVE AS کلیک دەکەین و بەناوێکی نوێ وێنەکەمان سەیڤ دەکەین .

سەیری وێنەی ژمارە (٥) بکە:

ئێستا ئەگەر ئەم وێنەیە وەکو جاری یەکەم بە بەرنامەی MICROSOFTOFFICE PICTURE MANAGER بکەینەوە دەبینین کە قەبارەکەی زۆر بچووک بۆتەوە .

سەیری وێنەی ژمارە (٦) بکە:




وێنەی ژمارە (٤)




وێنەی ژمارە (٥)




وێنەی ژمارە (٦)

# زنجیرەی (١) بۆ فێربوونی بەرنامەی MULTIMEDIA BUILDER

سەرەتا پێم **باشە کە** لە یەکەم زنجیری ئەم بەرنامەیەدا باسێکی کارەکان و سوودەکانی ئەم بەرنامەیەتان بۆ پێناسە بکەم و هەروەها تایبەتمەندیەکان و پێکهاتەی رووبەر و لیستەکانی بەرنامەکە وچەندین شتی تر کە لە ناوەرۆکی بەرنامەکەدا هەن .

بەرنامەیMULTIMEDIA BUILDER بەرنامەیەکە بۆ درووست کردنی AUTORUN ئۆتۆ رەن بەکاردێت واتا دەتوانن بە هۆی ئەم بەرنامەیەوە کردنەوەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ کۆمەڵە بەرنامەیەک درووست بکەن کە. پێی دەگوترێ AUTORUN ئۆتۆ رەن و دواتر ئەو کۆمەڵ بەرنامەیە بخەنە سەر سیدیەکی بەتاڵ بۆ ئەوەی لە کاتی دانانی سیدیەکە لەسەر ئامێری کۆمپیوتەرەکە ڕاستەوخۆ سیدیەکە بکەوێتە کار کردن و ئەو کۆمەڵە بەرنامەیەی کە لە ناو سیدیەکەدا دانراون **بە** شێوەیەکی جوان و شایستە بەرنامەکانتان نیشان بدات یان پێناسەی بەرنامەکانتان لە گۆشەیەکی AUTORUN ئۆتۆ رەنەکە نیشان بدات ئنجا بۆ ئەو مەبەستە دەتوانن ئەم بەرنامەیە بەم شێوەیە بەکار بێنن تا بتوانن ئەرشیفێکی جوان بۆ خۆتان لەماڵەوە یان لە نووسینگە یان لە هەر **جێگایەک** بێت ئامادە بکەن .

**ئامادەکردنی: باوکی ئاڵا**

## رووبەری بەرنامەکە




پێناسەی بەشەکانی شریتی MAIN وێنەی ١

١- هێنانی پەڕێکی نوێ بۆ ناو بەرنامەکە.

٢- هێنانی نموونەیەکی ئامادە کراو لە لایەن ستافی بەرنامەکەوە

٣- کردنەوەی بەشێکی پارێزراو

٤- پاراستن - حفظ - کردنی کارەکان.

٥- لەبەر گرتنەوەی بەشێکی دیاری کراو

٦- دانانی بەشە لەبەرگیراوەکە.

٧- دانانی وێنەیەکی لەبەرگیراو.

٨- گەڕانەوە بۆ هەنگاوی پێشوو.

٩- دووبارە لابردنەوەی هەنگاوی پێشوو.

١٠- دەرخستنی تایبەتمەندیەکانی پەڕەکە.

١١- نیشاندانی شریتی پەڕەکان لە ڕیزەوەی رووبەری بەرنامەکە.

١٢- نیشاندانی شریتی بەشە بەکارهاتووەکان.




وێنەی ٢




وێنەی ٣

**پێناسەی**

**شریتی بەشەکانی Tools وێنەی (٢)**

١- دیاری کردن لە ناو پەڕەکە.
٢- دانانی تێکست بە کیبۆرد لە ناو پەڕەکە.
٣- دانانی پەرەگرافێکی نووسین لە ناو پەڕەکە.
٤- دانانی دوگمەی نووسین لە ناو پەڕەکان.
٥- دانانی وێنە لە ناو پەڕەکان.
٦- دانانی دوگمەی وێنە لە ناو پەڕەکان.
٧- دانانی چوار گۆشەی نووسین لە ناو پەڕەکان.
٨- دانانی وێنەیەکی جوڵاو لە ناو پەڕەکان.
٩- دانانی پارچە ڤیدیۆیەک لە ناو پەڕەکان.
١٠- دانانی وێنەیەک کە توانای جوڵاندنەوەی هەیە بە هۆی ماوسەکەوە.
١١- دانانی چەند وێنەیەک کە بە شێوەی دوا بە دوای یەک دەگۆڕێن.
١٢- دانانی شێوەی ڕەنگاو ڕەنگی جوڵاو لە ناو بەشەکانی یان لە ناو پەڕەکان.
١٣- دانانی چوار گۆشەیەکی بەستنەوەی پەیوەندی.
١٤-دانانی بازنەیەکی بەستنەوەی پەیوەندی.
١٥- دانانی خەتێکی راست یان لار لە ناو بەشەکان یان لە ناو پەڕەکان.
١٦- دانانی چوار گۆشەی نادیار لەسەر نووسین یان وێنە بۆ بەستنەوەی پەیوەندی.
١٧- دانانی گۆڕانکاریەکی دیاری کراو لە ناو بەشێک یان لە ناو پەڕێک
١٨- دانانی دوگمەیەکی ئامادە کراو.
١٩- دانانی فایلاتی جۆری HTML لە ناو پەڕەکان.
٢٠- دانانی فایلاتی جۆری EXE لە ناو پەڕەکان.
٢١- دانانی پارچە ڤیدیۆیەک لە جۆری AVI لە ناو پەڕەکان.
٢٢- دانانی فایلاتی جۆری فلاش یان SWF لە ناو پەڕەکان.
٢٣- دانانی ئیکۆلایزری دەنگی لە ناو پەڕەکان.
٢٤- دانانی لیستێک بۆ بەشەکانی ناو پەڕەکە.

**پێناسەی**

**شریتی بەشەکانی Tools وێنەی (٣)**

١- زیاد کردنی پەڕێکی تر بۆ AUTORUN .
٢- چوونە سەر پەڕی سەرەکی لە ناو ڕووبەری بەرنامەکە.
٣- چوونە سەر لایەری سەرەکی بەرنامەکە.
٤- بینینی بەشەکان لە ناو ڕووبەری سەرەکی بەرنامەکە.
٥- سڕینەوەی پەڕێک لە ناو ڕووبەرەکە.
٦- چوونە سەر پەڕی پێشوو.
٧- چوونە سەر پەڕی داهاتوو.
٨- ئەنجام دانی گۆڕانکاری لەسەر پەڕەکان و لەبەر گرتنەوەی پەڕەکان.
٩- تایبەتمەندیەکانی پەڕەکان.
١٠-بینینی زانیاریەکانی دەرخستەی پەڕەکان.
١١- بینینی دەرخستەی کارەکان.



وێنه‌ی ٤

**پێناسه‌ی شریتی نیشاندانی به‌شه به‌کارهاتووکان وێنه‌ی (٤)**

ئه‌م شریته تایبه‌ته به نیشاندانی ئه‌و به‌شانه‌ی که به‌کار ئه‌هێنرین له ناو په‌ڕه‌کان واتا هه‌ر به‌شێک له ناو په‌ڕه‌کان به کار بهێنرێت ئه‌وه له سه‌ر ئه‌م شریته ئه‌و به‌شه به‌کار هاتووانه‌تان نیشان ده‌دات ئینجا له ڕێگای ئه‌و شریته‌وه ده‌توانن گۆڕانکاری بکه‌ن له‌سه‌ر به‌شه‌کان له به‌شه‌کانی تردا نموونه‌تان بۆ باس ده‌که‌ین .

**پێناسه‌ی په‌ڕی سه‌ره‌کی کاره‌کان وێنه‌ی (٥)**

کاری ئه‌م به‌شه ئه‌وه‌یه که ده‌توانین هه‌موو کاره‌کانی دروست کردنی AUTORUN لێره‌وه ده‌ست پێ بکه‌ین وه‌کوو دانانی وێنه و دانانی نووسین و دانانی به‌ستنه‌وه‌ی په‌یوه‌ندی و دانانی جوڵه له نیوان په‌ره‌کان هه‌موو ئه‌م کارانه و چه‌ندین کاری تریش له ڕێگای ئه‌م به‌شه‌وه ده‌کرێت که به به‌شی سه‌ره‌کی ناسراو ئێمه له زنجیره‌کانی تری به‌رنامه‌که نموونه‌ی پیویستتان بۆ ئاماده ده‌که‌ین.

**پێناسه‌ی شریتی په‌ڕه‌کان وێنه‌ی (٦)**

کاری ئه‌م شریته نیشاندانی هه‌موو ئه‌و په‌ڕانه‌یه که ئێوه کاریان له‌سه‌ر ده‌که‌ن و له ڕێگای ئه‌م شریته‌وه ده‌توانن په‌ڕه‌کان ڕێک بخه‌ن یان تایبه‌تمه‌ندیه‌کانی په‌ڕه‌کان ببینن یان په‌ڕێک پێش په‌ڕێکی تر بخه‌ن یان هه‌ندێک کاری تر که ئێمه له به‌شه‌کانی زنجیره‌که‌ماندا به ته‌واوی باسیان ده‌که‌ین .




وێنه‌ی ٥




وێنه‌ی ٦



# بەرنامەی (نۆف) NOUF

ئامادەکردنی: ئیڤان قادر



ڕەنگە باوەر نەکەن کە دەبیستن بەرنامەیەکی لەم چەشنە هەبێت کە کارێکی زۆر گرنگ دەکات و قەبارەیەکی زۆر کەمی هەیە بەرنامەی نۆف کە بەرنامەیکی ئەلکترۆنیە و تەواوی قورئانی پیرۆزی لە سەر تۆمار کراوە و بە دەنگی ١٠ خوێنەری قورئانی پیرۆز و بە یەکێک لە گەورەترین بەرنامەکانی جیهان دەژمێردرێت کە تیایدا پێشکەوتنێکی لە جۆری LMS LIVE MEDIA SPIDER بەکار هێنراوە وە ئەو پێشکەوتنە کار ئاسانی بۆ بەکارهێنەری بەرنامەکە دەکات کە بتوانێ گوێ بیستی ژمارەیێکی زۆری دەنگی بێت بە هەڵبژاردەیەکی باش و قەبارەیێکی کەم، شایانی باسە ئەو بەرنامەیە ١٠ قورئانی پیرۆزی لە ناودا خەزن کراوە کە دەکاتە ١١٤٠ بابەتی دەنگی و بە دەنگی ١٠ قورئان خوێنی بەرێز کە کۆی ئەم هەموو بابەتانە قەبارەیان تەنها (4 MB) واتا قەبارەی تەنها یەک فایلی جۆری MP3 .

## تێبینی:

ئەم بەرنامەیە پێویستی بە هێڵی ئەنتەرنێت هەیە واتا دوای دابەزاندنی بەرنامەکە بۆ کار پێ کردن و گوێ بیستنی بابەتەکان دەبێت ئامێری کۆمپیوتەرەکە بە ئەنتەرنێتەوە بەستراوە بێت، ئەمەش سایتی بەرنامەکەیە .HTTP://NOUF ORG/SPIRIT.PHP

# چۆن ده‌بیته‌ خاوه‌ن ماڵپه‌رێک به‌ خۆڕایی

شاخه‌وان عمر

Address http://50megs.com/

Thank you for visiting 50megs...home of incredibly affordable web hosting. We've been providing web hosting solutions to millions of customers since 1999, and we're pretty amazing at what we do. Our web hosting packages are at wholesale prices so rest assured you're getting a great price. We have a variety of web hosting packages customized to meet your needs, **so sign up now...it's fast and easy.**

GOOD
Ad Supported
Sign Me Up!
Our free hosting package gives you so much more than anyone else's free offer. It's a great way to start your own website... and get it for free.
$0.00 /month

BETTER
Basic Web Hosting
Sign Me Up!
Our basic hosting package has all of the features of our free package without the annoying banners and popups! If you want a great website at our lowest price, then this web hosting package is for you!
$1.99 /month

BEST
Starter Plus
Sign Me Up!
Definitely our most popular! This hosting package offers you everything you need and more... WAY MORE than any competitor.
**SIGN UP NOW** and take advantage of this special offer.
$3.32 /month

Done Internet

وێنه‌ی ژماره‌(١)

زۆرن ئـه‌و مـاڵـپـه‌رانـه‌ی كه‌ خزمه‌تگوزاری پێدانی ماڵپه‌ر به‌ خـۆڕایـی ده‌ده‌نــه‌ بـه‌شـداربـوانـی ئه‌نته‌رنێت به‌ڵام ماڵپه‌ری WWW.5U.COM ماڵپه‌رێكت به‌خۆرایی پێده‌دات بـه‌گـه‌وره‌تـریـن قـه‌بـاره‌ لـه‌چـاو ماڵپه‌ره‌كانی تر كه‌ ئه‌ویش ٥٠ مێگا بایته‌و له‌ هه‌مان كاتدا ده‌توانیت تا ماوه‌یه‌كی زۆرو به‌قه‌باره‌یه‌كی زۆر ئـاڵـوگـۆڕی فـایـلـه‌كان له‌ناو ماڵپه‌ره‌كه‌ت بكه‌یت كه‌بریتیه‌ له‌ ٢ گێگا بـایـت، چونكه‌ ئاڵوگۆری فـایـلـه‌كـان زۆر پێویسته‌ لـه‌ نـاو ماڵپه‌ڕه‌كه‌ت له‌كاتی زیادكردنی به‌شێك یان گۆڕینی به‌شێك.

دروســـت كـردنـی مـاڵـپـه‌ر لـه‌م ماڵپه‌ره‌دا زۆر ئاسانه‌ . له‌ دوای كردنه‌وه‌ ماڵپه‌ره‌كه‌ كلیك له‌سه‌ر SIGN ME UP بكه‌ كـه‌ بـه‌ باش وه‌نـســف كـــراوه‌ GOOD بـڕوانـه‌ وێنه‌ی ژماره‌(١) . پاشان چاوه‌ڕوان ده‌كـه‌یـت لـه‌ پـه‌ڕی دوه‌مـــدا كلیك لـه‌سـه‌ر خـانـه‌ی FREE ده‌كـه‌یـت ئـه‌و نـاوه‌ ده‌نوسیت له‌ خانه‌كه‌دا كـه‌ ده‌تــه‌وێ مـاڵـپـه‌ڕه‌كـه‌ت به‌ناو بكه‌یت بڕوانه‌ وێنه‌ی ژماره‌ (٢) له‌ دوایی دا پاشبه‌ندێك به‌ ئاره‌زوی خۆت هه‌ڵبژێره‌ دوایی كلیك له‌سه‌ر (NEXT) بـكـه‌ كـه‌ لـه‌ وێنه‌كه‌ش ڕونـكـراوه‌تـه‌وه‌ چـــاوه‌ڕوان بـه‌ تا وه‌ڵامت ده‌درێته‌وه‌.

پاشان وه‌كو له‌ وێنه‌ی ژمـاره‌ (٣) ڕوونكراوه‌ته‌وه‌ (FREE WEB HOSTING) هه‌ڵده‌بژێرین دوایی كلیك ده‌كـه‌یـن لـه‌سـه‌ر (SIGN UP) پاشان له‌ په‌ڕی دواییدا كلیك لـه‌سـه‌ر(...NO THANKS) ده‌كه‌ین وه‌ك له‌وێنه‌ی ژمـاره‌ (٤) دیـاره‌

ئینجا ئه‌و فۆرمه‌ی دێته پێشت به ته‌واوی پڕیکه‌ره‌وه وه‌ک به‌شیکی ڕونکراوه‌ته‌وه له‌وێنه‌ی (٥) دوایی کلیک له‌سه‌ر NEXT بکه چاوه‌ڕوان به تا وه‌ڵامت ده‌درێته‌وه. مه‌رجه خاوه‌نی پۆستێکی ئه‌لیکترۆنی تایبه‌ت به‌خۆت بیت بۆ ئه‌وه‌ی ته‌واوی زانیاریه‌کانی ئه‌و ماڵپه‌ره‌که‌ی خۆت بۆ ڕه‌وانه بکات، له کۆتایی ته‌واوی زانیاریه‌کانت پیشان ده‌دات و بۆ ئه‌وه‌ی ڕه‌زامه‌ند بیت کلیک بکه له‌سه‌ر LOGINTO SITE وه‌ک له وێنه‌ی (٦) دیاره به‌م شێوه‌یه ده‌بیته خاوه‌ن ماڵپه‌ڕێکی تایبه‌ت به‌خۆت له دوایدا شێوه‌و شێوازی ماڵپه‌ڕه‌که به ئاره‌زوی خۆت هه‌ڵده‌بژێری.

وێنه‌ی ژماره‌(٢)

وێنه‌ی ژماره‌(٣)

وێنه‌ی ژماره‌(٤)

وێنه‌ی ژماره‌(٥)

وێنه‌ی ژماره‌(٦)

# بەکارهێنانی کامیرای کۆمپیوتەر بۆ چاودێری کردن



لەگەڵ دابەزینی نرخی کامیرای بچوک ئاسانی دانان و بەکارهێنانی وای کردووە کە کۆمپیوتەری کەسی لە هێلی پێشەوەی بەرەی بەرگری بێ لە نەتەوە، لە ڕێگای بەکارهێنانی ئەم جۆرە کامیرایانە بۆ چاودێری کردنی شوێنە گرنگەکان و فەرمانگەکان و بگرە تاکو بەکارهێنانی بۆ چاودێریکردنی ماڵ و سامانی تاکەکەسیش.

بیرۆکەی دانانی کامیرای کۆمپیوتەری بۆ چاودێری کردن و تۆمارکردنی کاری دزی و زیان بەخش بە نەتەوەو کاری تر پێشتر لە ئارادابوو بەڵام چالاکانە بەکار نەئەهات لەبەر نەبوونی پرۆگرامی پێویست و بەردەست بۆ ئەم کارە، بەڵام ئێستا هەر کاتێک کامیرایەکی کۆمپیوتەری دەکڕیت بەرنامەیکی لەگەڵ دایە کە ئەوکارەی چاودێری کردن و گرتنی وێنەی پێ دەکرێت. ئەم تەکنیکە زۆر نوێترە لە کامیرای ڤیدیۆی تەقلیدی کە وێنەکان لەسەر کاسێت تۆمار دەکات.

### هونەری هەستکردن بە جوڵانەوە:

کاری چاودێری کردن بە درێژای ٢٤ سەعات وبە بێ پسانەو کارێکی گرانەو بەتەنها بەتاکە کەسێک ناکرێت لە دیار کامیراو تۆماری ڤیدیۆ دابنیشێت تا ئەوکاتە دزێک یان هەرشتێک کە باری هێمنی تێک بدات تۆمار بکات، هەروەها چاودێری کردن بەکامیرای کۆمپیوتەر وتۆمارکردنی بەدرێژایی ٢٤ سەعات قەبارەیەکی زۆر گەورە لە هارد دیسک دەگرێت و کە مایەی نیگەرانیە، بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم گرفتە بەکارهێنانی پرۆگرامی هەستکردنە بە جووڵانەوەی تەنەکان، لەم سەردەمەدا ئەم جۆرە تەکنیکە بەشێوەیەکی زۆرتر بەکاردێت لە کاتی پەیوەندی کردنی تەلەفۆنی و ڤیدیۆی بە بەکارهێنانی پرۆگرامەکانی ئنتەرنێت وەک MESSENGER کە ناخوازێت کامیراکە وێنەکان بە بێگۆڕان بمێننەوە، بەڵکو بەردەوام لەکاتی جوڵان و قسەکردندا گۆڕانکاری لە وێنەکان پیشان دەدات.

بەهەمان شێوە ئەتوانرێت ئەم پرۆگرامە بەکاربهێنرێت بۆ چاودێری کردنی تاوانباران و بەدواداچوونیان، بە بوونی پرۆگرامی هەستکردن بەجووڵە،




تەنها جوولەیەک بەسە بۆ هەستکردنی کۆمپیوتەرو دەست ئەکات بە تۆمارکردن و کۆگەکردنی وێنەکان، بەم شێوەیە تەنها ئەو کاتانە تۆمار دەکات کە جوولەیان تێدایە، بەمەش قەبارەی کۆگەکردن زۆر کەم دەکاتەوە.

هەندێ پرۆگرام هەن کە نامەیەکی ئاگادارکردنەوە ئەنێرن بۆ تەلەفۆنی مۆبایل، بەڵام بۆ زیاتر پاراستنی وێنەکان لە ئەگەری دزینی کۆمپیوتەرەکە خۆی باشتر وایە پرۆگرامەکە وا ئامادەبکرێت کە دوای گرتنی وێنەکان بیانێرێت بۆ شوێنێک لە ئەنتەرنێت، بۆ ئەم مەبەستە وا پێویستە کە هەندێ لە هونەرکاری پرۆگرامی تۆمارکردن و رێکخستنی کاری کامێراکە بزانێت.

بۆ نموونە: ئەم کامیرایەی خوارەوە کە ناسراوە بە NET9600 IPNETWORKCAMERA/SERVER بەشێوەیەکی ئۆتوماتیکی وێنەکان ئەگوازێتەوە بۆ سەر وێب و بۆ ئیش پێکردنی پێویستی بەبوونی کۆمپیوتەر نییەو و ئەتوانرێت وێنەکە بە هۆی پرۆگرامی WEB BROWSER ببینرێن وە ئەتوانرێت IP ADDRESS ی بدرێتی خۆشی کار بە پرۆگرامی WEB SERVER ئەکات و وێنە زیندووەکان لە ویندۆز، لینۆکس، ماک و یونیکس دا دەبینرێن.

ئەبەسترێتەوە بە تۆری کۆمپیوتەری LAN یان کێبل یان DSL.

بۆ سوود وەرگرتن لەم جۆرە خزمەتگوزاریە باشتر وایە پەیوەندی بکەیت بەیەکێک لەو کۆمپیانیایانەی کە ئەم خزمەتگوزاریە پێشکەش دەکەن و ئاسانکاریت بۆ دەکەن لە گواستنەوەی وێنەکان بۆ ئنتەرنێت و هەوەرها لەکاتی وەگرتنەوەی وێنەکان بەکارهێنانیان.






پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیاو زانست لە جیهاندا زۆر بە خێرایی دەڕوات، داهێنان و پەرەسەندنەکانیش لە بواری ئەنتەرنێت بێشومار زیاد دەکات گۆڕانی خێرا خێراش بە خۆیەوە دەبینێت . ئەوندەی خەڵک ئارەزوی خزمەتکردن و بەرەو پێش چونی مرۆڤایەتی دەکەن، ئەوەندەی زاناو مرۆڤە بلیمەتەکان هەوڵی فێربوونی هاورەگەزەکانی خۆیان دەدەن ئەنتەرنێت لە دامەزراوەیەکی بچوک و کەم خزمەت گەیشتە دامەزراوەیەکی وا پێشکەوتوو پڕ خزمەتگوزاری تا گەیشتە ئەو ڕادەی دەنگی خەڵک بگات بە یەک لە سەرانسەری جیهان. لە پاڵ ئەمەشدا خەڵکانێک هەن هەوڵی لادان و بەرەو دواوەو گەڕاندنەوەی ئەم ڕەوتە زانستە گەورەیە دەدەن یان هەوڵ دەدەن بۆ بەرژەوندیە تایبەتیەکانی خۆیان بەکاربێنن و زیان بە مرۆڤایەتی بگەیەنن .

یەکێک لە پسپۆڕەکانی زانستی کۆمپیوتەر لەفنلەندا پێشبینی لەناوچونی تۆڕی زانیاری جیهانی (ئەنتەرنێت) دەکات لەماوەی چەند ساڵێکی داهاتودا. (د.کاری) مامۆستا لەزانستی کۆمپیوتەر لە زانکۆی (هێلنسکی) تەکنەلۆژی بە ئاژانسی کۆنای کویتی ڕاگەیاند کە ئەم لەناو چونە لە ناوچونێکی مادی دەبێت بەهۆی زۆری ڤایرۆسەکان لەناو کۆمپیوتەر و لە هەمان کاتدا لە ناوچونێکی مەعنەوی دەبێت کە دەبێتە هۆی بێزاربوونی بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت . ئەوەی کە جێی مەترسییە هەندێک لە کۆمپانیا گەورەکان کە کار لەناو ئەنتەرنێت دەکەن پارەیەکی ئێگجار زۆر دەدەنە ئەو چەتانە تاکو ماڵپەڕەکانیان تووشی ڤایرۆس نەکەن، وە لە هەمان کاتدا ماڵپەڕەکانیان تێک نەدرێن و گران نەبن بەهۆی نامە ساختەکان و پاشکۆ ئەلیکترۆنیەکان کە دەبێتە تێکدانی کۆمپیوتەرەکان .

لە بەر ئەوەی هیچ میکانیزمێک نییە تاکو ڕێگر بێت و دەست بەسەر ئەم نامە و پاشکۆ ئەلیکترۆنیەکان دا بگرن بەمەش بارودۆخێک دروست دەکات کەدەبێتە هۆی تێکدانی ڕێکو پێکی ماڵپەڕەکە لەناو تۆڕی ئەنتەرنێت . یەکێکی تر لە کێشە گەورەکان هاکەرزەکان و چەتەکانن کە دەتوانن بچنە ناو پۆستی ئەلیکترۆنی هەر کەسێک و نامەش بەناوی ئەوەوە ڕەوانە بکەن. (د.کاری) ئەوشی ڕاگەیاند کە هیچ سیستەمێک نییە ١٠٠٪ پارێزگاری لە خراپ بەکارهێنانی ئەنتەرنێت بکات بەڵام توانراوە ئەم زیانانە کەم بکرێنەوە. کارتی بانکەکان لە ئەنتەرنێت زۆرترین پشێویان تێدایەو لە هەموو بەشەکانی تر زیانی بەرکەوتوە بەجۆرێک ڕێژەیەکی زۆر لە بەکارهێنەرانی بانکی ئەلیکترۆنی گرتۆتەوە بەهۆی دزین و لەناو بردنی ژمارەی نهێنی کارتی بانکەکان.

# ئایا دەتوانرێ سنورێک بۆ تاوانەکانی ئەنتەرنێت دابنرێت



لە گەڵ سەرهەڵدانی بڵاوبونەوەی ڤایرۆس لەناو تۆڕەکانی ئەنتەرنێت و تووشبونی کۆمپیوتەرەکان تاوانەکانی ئەنتەرنێت پەرەیان سەند بە گوێرەی دەرخستنی ئامارەکان ساڵی ٢٠٠٤ تاکو ئێستا پڕ مەترسیترین ساڵ بوو لە هێرشەکان و هەڕشەکردن و دروست کردنی پشێوی لەناو ڕایەڵەی ئەنتەرنێتدا مەترسیدارترینیان ئەو ڤایرۆسە بوو کە زیاتر لە ٣ ٪ کۆمپیوتەرەکانی ئەوروپای توشکردو زیانی پێگەیاندن .ئامارە نوێ یەکان دەردەخەن کە بۆ ئەمساڵ ژمارەی نامە ئەلیکترۆنییە ڕیکلامیەکان و ساختەکان دوو ئەوندەی ساڵی پار زیادیان کردوە، کۆمپانیای (فرەنت بریدج) بۆ ئاسایشی ئەلیکترۆنی ڕایگەیاند کە رۆژانە ٥٠ ملیار نامەی هەڕەمەکی و ساختە لە سەرانسەری جیهان لەڕێی تۆڕی ئەنتەرنێت دەگۆڕدرێنەوە ئەم ڕێژەیەش بۆ دووئەوەندە زیاد دەکات بۆ ساڵی ئایندە. یەکێتی

نێو دەوڵەتی بۆ پەیوەندی تەل و بێ تەلەکان کە دامەزراوەیەکی جیهانییە نەتەوە یەکگرتوەکان سەرپەرشتی دەکات، ڕونی کردەوە کە تاکو ئێستا کاردەکەین بۆ بنەبڕکردن و نەهێشتن و دەست بەسەرداگرتنی ئەنتەرنێت، بۆ ئەم مەبەستەش چەند لیژنەیەکی زانستی و ئەمنیمان دامەزراندوە چونکە ڕاستەوخۆ کاریگەری دەبێ لە سەر ڕەوشی زانست و تۆڕی ئەنتەرنێت .



دەزگای (ئایکان) کە بارەگاکەی لە کالیفۆرنیایە یەکێکە لە گەورترین دامەزراوەی سەرپەرشتیاری ئەنتەرنێت ئاشکرای کرد کە وولاتە تازە پێگەیشتوەکان داوایان کردوە کە دەزگا زانستیەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتوەکان سەرپەرشتی بەڕێوەبردنی ئەنتەرنێت بکە لە دابەشکردنی ماڵپەڕو دانانی شوێنەکانی ئەنتەرنێت و دژایەتی کردنی چەتەو هاکەرزەکان و ئاگاداربوون لەو نامانەی کە دەبنە هۆی تێکدانی ڕایەڵەکانی ئەنتەرنێت چونکە بەپێی دوا زانیارییەکان زۆرترین زیان لە تۆڕی ئەنتەرنێت بەر وولاتە تازە پێگەیشتوەکان دەکەوێ بە بەراورد لەگەڵ وولاتانی تر . یەکێک لەتاوانە مەترسیدارەکان زیادبوونی ژمارەی ڤایرۆسەکانە لە کاتی دابەزاندنی هەندێ لە بەرنامە گرنگەکان، دەرکەوتوە لە کاتی دابەزاندنی هەر بەرنامەیەک زیاتر لە ١٠٠ هەزار ڤایرۆس خۆی دەخاتە پاڵ بەرنامەکە وە چاوەڕوان دەکرێت ئەم ڕێژەیە زیادبکات بە ڕێژەی٥٠٪، ئەوەی شایانی باسە ئەو کەسانەی کە خەڵک هەڵدەخەڵەتێنن بە نامەی ئەلیکترۆنی ٣٠٪ زیادیان کردوە بەمەش هێرشەکانی کۆمپیوتەر ئاڵۆزتر دەکات .

(گراهام کلۆیلی) یەکێکە لە گەورەترین ڕاوێژکارانی کۆمپانیای (سۆفوس) بۆ لە ناو بردنی ڤایرۆس دەری خست لە گەڵ زیادبوونی دابەزاندن و وەرگرتنی پرۆگرام لە ئەنتەرنێت و زیادبوونی داوا لەسەر کەلوپەلەکانی ناو ئەنتەرنێت بەهۆی هەرزانی نرخیانەوە چەتەکان هەوڵدەدەن ژمارەی نهێنی کارتی بانکەکان ببەن ئەویش بەهۆی دروست کردنی بانکی ساختە و بەدرۆ بۆ هەڵخەڵەتاندنی کڕیارەکان لە دوای وەرگرتنی کارتی بانکەکە ژمارەی نهێنی کەسەکە لەناودەبەن. ئەم ساختە کاری و دزی و تووشکردنی کۆمپیوتەرەکان بە ڤایرۆس و تێکدانە ڕایەڵەکان وای لە لایەنە پەیوەندیدارەکان کردوە کە هەڵسن بە دروستکردنی لیژنەو دامەزراوەی تایبەت بە ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەرو ڕێگەگرتن لە چەتەکان و هۆشیارکردنەوەی بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت، ئەوەی شایانی باس بێ ساڵانە لە ڕێی تاوانەکانی ئەنتەرنێت سەدان ملیۆن دۆلار بە هەدەر دەڕوات و خەڵکانێکی زۆر زەرەرمەند دەبن تیایدا .

# لە ساڵی ٢٠٠٨ دا دەتوانی لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە فلیمێکی سینەمایی لە ماوەی چەند چرکەیەک دابەزێنی

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: شیماء عصام الدین



کۆمپانیا بەهێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پلان دادەرێژن بۆ پەرەپێدانی پێشکەوتنەکانی ئەنتەرنێتی خێرا٠ کە لەهەوڵی ئەوەدان خێرایی بڵاوکردنەوەی زانیاریەکانی تێدا زیاد بکەن بە ڕێژەی ١٦٠٠٪ کە پێشتر ڕێژەکە تەنها ٤٠٪ بووە.

شایانی باسە کۆمپانیای سیسکوو موتورۆلا هەمانگی ئەکات لەگەڵ کۆمپانیایەکانی تر بۆ ئەنجام دانی ئەم پرۆژەیە کەچاوەڕوان دەکرێت تا ساڵی ٢٠٠٨ بگاتە ئەو ئاستەی کە بتوانرێ لە ماوەی چەند چرکەیەک فلیمێکی سینەمایی دابەزینیتە سەر ئامێرەکەت.

# چینیەکان لەڕێگای ئەنتەرنێتەوە یادی مردوەکانیان دەکەنەوە

وەرگێرانی لە عەرەبییەوە:
اسحاق خالند

سەدان چینی بە بۆنەی زیندووکردنەوەی ئاهەنگی یادکردنەوەی کێنگ مێنگە سەدان مۆم و چیلکە بخوری خەیالیان داگیرسان، بەلکو چەندەها دەسکە گولی ژمارەیان لە ڕێگای کۆمپیوتەرەوە گۆڕیەوە. ئەم ڕۆژەش بە ڕۆژێکی پشوی چینی کلاسیکی دادەنرێ هاوولاتیە چینیەکان تیادا هەلدەستن بە یادکردنەوەی پێشینەکانیان وکۆبونەوە لە گۆڕستانەکانیان لە ئاهەنگێکی سالانەی گەورە، بەلام ئەوەی تازەیە ئەم سال، هەستانی ژمارەیەکی زۆر لە گەنجانی چین بە گۆڕینی شێوازی ئاهەنگەکەیان، گوایە لەم ئاهەنگێڕانە کلاسیکیە بەم بۆنەیەوە کە بریتیە لەبخور هەلگیرساندن و پێشکەشکردنی خواردن و خواردنەوە و ئامادەکردنی یاری ئاگری شێوازێکی کۆنەو پێویستە بگۆردرێ لە چەرخی ئەنتەرنێت، ئەو پێش خستنەی ئەوگەنجانە ویستیان، خەم خواردنێک بوو بۆ لەمەودای ئەنترنێت،کاتی وێنەی مۆم و چیلکە بخور ئەکێشن وێنەی گول بۆیەک ڕەوانە ئەکەن، ئەم شێوازە تازەیەش کە گەنجەکان بە نوێ بوونەوەی دادەنێن و جوانێکی زیاتری ئەبەخشێ بە ئاهەنگەکە، وەلەمەش گرنگتر ماندوو بوونی سەفەر و گواستنەوە و بڕینی ڕێگایەکی زۆر بۆسەردانی گۆڕی باپیرانیان نزیک دەکاتەوە، پسپۆڕەکان وا ئەبینن ئەم شێوازە لە گۆڕان ئەیسەلمێنێ کە تەکنەلۆجیای نوێ توانای گۆڕینی بیروباوەڕی خەلکی هەیە، بەلکو توانای گۆڕینی بۆچونەکانیان لەچۆنیەتی بەختەوەرکردنی خزم وکەسیان لەو دونیایە...



**وەرگێڕانی لە فارسییەوە:**
**نیکار صابر عبدالله**

ئامێرێکــی ئەلیکترۆنییــە، وەک کاڵایەک لە کۆمپیوتەر دەبەسترێت، بەکاردێــت وەک ڕێکخەرێــک بــۆ وەرگرتــن و ناردنــی زانیــاری و داتــا بەشــێوەی دیجیتــاڵ لەســەر هێڵێکی تەلەفۆن لە تــۆڕە کۆمپیوتەرییەکاندا.




گەر بمانەوێت دوو کۆمپیوتەری تەنیشــت یــەک پێکــەوە ببەســتین بەمەبســتی ئاڵوگــۆڕ پێکردنــی زانیاری لەنێوانیاندا، ئەوا بەکێبڵێکی تایبەتــی بەیەکیــان دەگەیەنیــن و کارەکە ئەنجــام ئەدەین، بەڵام گەر ئەو کۆمپیوتەرانــە دووربن لەیەک ئــەوا ناتوانیــن بەو کێبڵە یــان بەو ڕێگەچارەیــە پێکەوە بیانبەســتین، لەبەر نەبونــی کێبڵێکی بەوجــۆرە درێــژ وگونجاو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە.

خۆشبەختانە بەستنێکی دیکە هەیە کە دەتوانێت جێگەی ئەو کێبڵەمان بۆ بگرێتەوە، ئەویش بەهۆی هێڵی تەلەفون کردنەوەیە. لێرەدا گرفتێک دێتەکایەوە، ئەویش کۆمپیوتەر زانیاری و داتا بەشێوەی شەپۆلی ژمــارەیــی(دیــجــیــتــاڵ)DIGITAL SIGNAL دەنێرێت (لێرەدا ژمارەیی؛ مەبەست لە سفر و یەکە)، بەڵام کابینەی تەلفۆن کــردن و هێڵی گواستنەوەکانی بــەشــێــوەی شــەپــۆلــی گـــــــۆڕدراو (ئــەنــالــۆگ) ANALOG SIGNAL قسەکردن و دەنگ ڕاگوێز دەکەن وەک تەزووی کارەبایی.

لێرەدا مۆدێم کاری خۆی دەکات و زانیاری و نێردراوی کۆمپیوتەر کە بەشــێوەی شــەپۆلی ژمارەییە دەگۆڕێــت بۆ شــەپۆلی گــۆردراو (بەم کارەی دەڵێن MODULATOR) و بەشــێوەیەکی ئاســایی ڕاگوێــز دەبێت بەهێڵــی تەلەفۆندا. بەرامبەر بەمــەش مۆدێمێکی تــر زانیاریی و داتاکان وەردەگرێــت و دەیکاتەوە بە بەشــێوەی شــەپۆلی ژمارەیی، پێچەوانــەی کاری پێشــوو «بــەم کارەی دەڵێــن DEMODULATOR» و کۆمپیوتــەری وەرگــر زانیاریی و داتاکان بەشــێوەیەکی ڕێکوپێک وەردەگرێــت. مۆدێمیش لــەم دوو کارەیــەوە ناوەکــەی وەرگیــراوە؛ MODULATOR و DEMODULATOR کــە پێکــەوە ووشــەی MODEM پێکدێنن.

جۆرە بەســتنی ترمان هەیــە بۆ پەیوەنــدی کــردن و ڕاگوێزکردن وەک :

ISDN کــە کورتکــراوەی (INTEGRATES SERVICES DIGITAL NETWORK)ە، کــە بەشــێوەی دیجیتــاڵ و بەخێرایــی ٦٤٠٠٠ بیــت کار دەکات. شــایەنی باسە دوو کەناڵی ڕاگواستنی هەیە بۆ ئەو مەبەستە B1,B2 هەردووکی بەکاربن خێرایی ڕاگواســتن دەبێت بــە ١٢٨٠٠٠بیــت. هەڵبەتــە ISDN نێوەندێکــی جیــاوازی هەیــە وەک لــە مۆدێــم، لەنێــوان کۆمپیوتەر و ڕایەڵەی ISDN ەکەدا.

دوو جۆر مـۆدێـم هـەیـە کەلە کۆمپیوتەر دەبەسترێت؛ ناوەکی INTERNAL و دەرەکی EXTERNAL. مۆدێمی نـاوەکی وەک کارتێکی

CARD لێکبەستنە (پارچە بۆردێکە چەند سورێکی ئەلیکترۆنیی لەسە نەخشان کراوە بۆ ئەنجامدانی کارێک..) کە لەناو کۆمپیوتەرەکەدا دادەمەزرێنرێت، مۆدێمی دەرەکیش وەک ئامێرێکی جیا بەهۆی کێبڵی خۆیەوە لە کۆمپیوتەر دەبەسترێت (لەسەر بەشێکی وەک: دوای یەک COM، دوای یەکی گشتی USB جێگیر دەکرێت) و تەزووی کارەبای خۆی بەجیا لەسەرچاوەی کارەباوە وەردەگرێت، بێگومان ناوەکی وزەی کارەبای لە کۆمپیوتەرەکەوە بۆ دێت.


مۆدێمێکی ناوەکی


مۆدێمێکی دەرەکی

مۆدێمی ترمان هەیە وەک PC-CARD MODEM کەپێشتر ناو دەبرا بە PCMCIA لە شێوەدا جیاوازی هەیە و قەبارەیەکەی بچووکە، سەرەتا بەکاردەهێنرا لەگەڵ جۆری هەڵگر LAPTOP دا.




گرنگترین خاڵ دەبێت لەکاتی کڕینی مۆدێمدا ڕەچاو بکرێ، خێرایی ئەنجامدانی کارەکەیەتی، تا مۆدێمێک خێراتربێت بەکاتێکی کەم زانیاریی و داتای زۆرتر ئاڵوگۆڕ دەکات و خەرجی کەمتر دەوێت.

باشترین پێوەریش بۆ پێناس کردنی خێرایی مۆدێم ژمارەی (بیت)ی ڕاگوێزراوە لە چرکەیەکدا "BIT PER SECOND 'BPS"، کە هەر بیتێکیش بریتییە لە ژمارە ١ یا سفر، کە دەڵێین خێرایی مۆدێمێک ٥٦ کیلۆ بیتە، واتە؛ لەچرکەیەکدا ٥٦ کیلۆ سفر و یەکی دەتوانێت وەربگرێ وە یا بنێرێت، مۆدێم کاری زۆر پێ ئەنجام دەدرێ، ناسراوترینی لەژیانی ئەمرۆماندا چوونە ناو تۆڕی ئینتەرنێتە و ئەنجامدانی هەموو کارەکانە کە ئەم خزمەتگوزارییە پێشکەشی دەکات (پۆست کردنی ئەلیکترۆنی EMAIL، فاکس، کڕین، هەواڵ...هتد)، هەروەها دەتوانین لە سیستەمێکی BBS بەشداری بین کە وەک مەڵبەندێک زۆربەی بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەری کەسی PC کۆدەکاتەوە و سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندە لەپرۆگرام و زانیاریدا.

شایەنی باسە مۆدێمی دەرەکی بۆ تەنها جۆرێکی کۆمپیوتەر دروست ناکرێت، بەڵکە دەتوانرێت لەگەڵ هەر جۆرە کۆمپیوتەرێکدا بەکاربهێنرێت، بۆ نموونە لەگەڵ ماکینتۆش MAC، کۆمپیوتەری کەسی PC یان ئەمیگا AMEGA بەڵام هەریەکەو کاڵای نەرمی SOFTWARE جیای خۆی لەگەڵدا دادەمەزرێت. مۆدێمی ناوەکی بەتایبەت بۆ جۆرێکی کۆمپیوتەر دروست ئەکرێت، بۆ نموونە مۆدێمێکی ناوەکی ماکینتۆش لە کۆمپیوتەری کەسی نابەسترێت و ناتوانین بەکاری بهێنین.

کاتێ ڕێژەی زانیاری وداتاکان زیادی کرد، پێداویستی خەڵکی کارێکی وای کرد پەرە بە ڕاگواستن و خێرایی مۆدێم بدرێت، داهێنانی مۆدێم بەگوێرەی خێرایی :

٣٠٠ بیت لە چرکەیەکدا سالانی ١٩٦٣ تاکو ١٩٨٣

١٢٠٠ بیت لە چرکەیەکدا سالانی ١٩٨٤ و ١٩٨٥

پاشان ٢٤٠٠ بیت لە چرکەیەکدا (V.22 BIS) ٩٦٠٠ بیت لە چرکەیەکدا کۆتایی ساڵی ١٩٩٠ و سەرەتای ١٩٩١ (V.32 BIS)

١٩,٢ کیلۆ بیت لە چرکەیەکدا

٢٨,٨ کیلۆ بیت لە چرکەیەکدا (V.24 BIS)

٣٣,٦ کیلۆ بیت لە چرکەیەکدا

٥٦ کیلۆ بیت لە چرکەیەکدا، کە لە ساڵی ١٩٩٨ دا بوو بە ستاندارد (V.90 BIS)

ADSL کە بەشێوەیەکی تیۆری خێراییەکەی دەگاتە ٨ مێگا بیت لە چرکەیەکدا، ساڵی ١٩٩٩ بەدواوە.

مۆدێم سیفەتی داواکردن و وەڵامدانەوەی هەیە لەیەک کاتدا، هاوکات بەهەردوو ئاراستە، بۆیە بە FULL-DUPLEX ناو ئەبرێت. خۆ ئەگەر هات و تەنها بەیەک ئاراستە ڕاگواستنی TRANSMISSION کرد لە یەک کاتدا ئەوە بە HALF-DUPLEX دائەنرێت.





# دەسگیرکردنی یەکێ لەچەتەکانی ئەنتەرنێت لە تایلاند

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:
هێرش اسماعیل

دەسەڵاتدارانی تایلەند پیاوێکیان دەسگیرکرد بەناوی (ئیجین کاریری ٥٥ساڵ) کەداواکرابوو لەلایەن دەزگای لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەمریکی بەهۆی فریودانی چەند بەرهەمهێنەرێکی ئەنتەرنێت و بەدەست هێنانی چەندین ملیۆن دۆلار بەبێ هیچ هەقێ .

دەستگیردنی کارێر لەیەکێ لە سەیرانگاکانی باتایا لەپاش ساڵێ لەچونی بۆ تایلەند بە پەساپۆرتی ساختە. وە بەگوێرەی هەواڵەکانی لێکۆڵینەوەی فیدرالی ئەمریکی (ئیجین کارێر) و(جیمس ئیبیرهارت).

سایتێکی کڕین وفرۆشتنیان لەکالیفۆرنیا بەڕێوە دەبرد و ناویان لێ نابوو(ییس ئینتەرمنت ) ودەسیان بەفریودانی بەرهەم هێنەران کرد لە سایتەکانی ئەنتەرنێت و١١ ملێون دۆلار یان لێ زەوت کردن لەساڵی ١٩٩٩ کۆمپانیاکە پڕوپاگەندەی ئەوەی ئەکرد کەکار لەپێش خستنی سایتێکی ئەنتەرنێت دەکا بۆ خزمەتەکانی ڤیدیۆ و بەڵێنی بەدیهێنانی دەسکەوت بۆزیاتر لە٨٠٠ بەرهەم هێنەر لە ویلایەتە یەکگرتووەکان٠ کەچی زۆربەی پارەکان ڕەوانەی حیساباتی بانقی دەرەوە کراون بەتایبەتی لە هۆنگ گۆنگ و سەنغافورە٠ وهیچ کەسیش لە بەرهەم هێنەرەکان تەنها سەنتێکیان وەرنەگرت،وسەرەڕای گرتنی یەکێ لە تاوانباران، حکومەتی فیدرالی نەیتوانیوە تا ئێستا ئەوی تریان بگرێت .




ئەنتەرنێت بەوە ناسراوە کە دەتوانێت زانیاری ببەخشێت و زانیاریش بگوازێتەوەی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، پەڕەکانی وێب کەبەشێکن لە تۆڕی ئەنتەرنێت دەتوانێت لە یەک کاتدا چەندەها زانیاری جۆراو جۆر دەستە بەر بکات بۆ بەکارهێنەر. بە دەست کەوتنی ئەو زانیاریانەش لە پەڕەکانی وێب لە سەر تواناو کارامەیی و داواکانی بەکارهێنەر ئەوەستێ. بەهۆی لینک کردنی زانیاریەکان دەتوانرێت لە ماڵپەڕێکەوە بگەینە چەندان زانیاری جۆراو جۆر. هەڵدانەوەو بە دەسکەوتنی ئەو ماڵپەڕانەی ئێمە بەدوایان دەگەڕێین خاڵێکی سەرەکییە لەگەڵ ئەوەشدا بە کەمترین ماوە زۆرترین زانیاری کۆبکەینەوە و بە ئاسانترین شێوەش بگەینە ئەو زانیاریانە. ئەوەی شایانی باسە ژمارەی پەڕەکانی وێب بە ملیۆنەها ژمارەن وەگەیشتن پێیانەوەیان و دۆزینەوەی ئەو ماڵپەڕانە کارێکی وائاسان نییە. زۆر جار گەڕان بەدوای زانیاریەکان لە ڕێی بزوێنەرەکانی گەڕان بەتەواوەتی نامانگەیێنێتە زانیاری تەواو ئەمەش لە بەر بە هەڵە گەیشتنی زانیارەکان

بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵدەدین هەر جارەو ماڵپەڕێکی گرنگ کە بتوانرێ زۆرترین بەکارهێنەران سودمەند بن تیایدا بڵاوبکەینەوەو تایبەندیەکانی دەربخەین .

ماڵپەڕی مەکتوب WWW. MAKTOOB.COM بە گەورەترین ماڵپەڕی عەرەبی دادەنرێ لە هەمان کاتیشدا زانیاری بەزمانی ئینگلیزیش بڵاودەکاتەوە، ئەو ماڵپەڕە زیاتر لە ١٠٠ خزمەت گوزاری گرنگی تێدایە لەڕێی ئەم ماڵپەڕەوە دەتوانین گەڕان بەدوای زانیاریەکان بکەین و وە بەستراوەتەوە بە زۆربەی بزوێنەرەکانی گەڕان . جیاوەزیەکی ئەم ماڵپەڕە لەگەڵ ماڵپەڕەکانی تر کە خزمەتگوزاری پۆستی ئەلیکترۆنی پێشکەش دەکەن ئەویە کە مەکتوب پۆستێکی ئەلیکترۆنی بە خۆڕایی پێشکەش بە بەکارهێنەرەکانی دەکات بە قەبارەی ١٠٠٠میگا بایت وە دەتوانی نامە لە هەموو پۆستە کانی تری ئەلیکترۆنی وەربگرێت و بنێرێ، ڕێگەدەدات بە ناردنی هەر فایلێک تا قەبارەی ٥٠ میگا بایت وە توانای هاوبەشی کردنی هەیە لە گەڵ سەرجەم ماڵپەڕەکانی تردا بۆ وەرگرتنی زانیاری و هەواڵ . یەکێکی تر لە تایبەتمەندیە گرنگەکانی ئەم ماڵپەڕە خوێندەوەی ڕۆژنامە گرنگەکانی جیهانە کە زیاتر لە ٥٠ ڕۆژنامەی جیهانی بە خۆڕایی پەڕەکانی هەڵدەدیەوە وەکو ڕۆژنامەکانی ( الشرق الأوسط، الأتحاد ،الحياة، نیورک تایمز ............) لە ڕێی ئەو ماڵپەڕەوە دەتوانیت بەشداربیت لە سەرجەم پێشبرکێ زانستی و هونەری گشتیەکان گرنگترنیان بانکی زانیاریکانە . دەتوانیت بگەیت بە چەندان بەرنامەو زانیارەی تەرفیهی وەکو (خوێندنەوەی بورجەکان و زانیاری دەربارەی بورجەکان و دروست کردنی هاوڕێ یەتی و ژن هێنان و شوو کردن لە ئەنتەرنێت و خوێندنەوەی نوێترین نوکتە و چەندان یاری و وەرگرتنی ئاواز بۆ مۆبایل و گوێگرتن لە مۆسیقا . هەروەها مەکتوب هەواڵی ڕۆژانە و ڕوداوەکانی ڕۆژ لە ڕێی پۆستی ئەلیکترۆنیتەوە ڕۆژانە بۆ دەنێرێت جگە لە مەش دەتوانرێت سوود لە قاموسی مەکتوب وەرگری . ڕوونکردنەوەی ئەم تایبەت مەندیانەی مەکتوب بۆ ئەویە تاکو بەکارهێنەرێکی کوردستان سوودمەند بێت لە زانیاریەکانی جیهان .

Maktoob.com Inc.: Arabic/English Free Webmail, E-Cards, Chatting, Business, Voting, Shopping, G - Microsoft I...

File Edit View Favorites Tools Help

Back Search Favorites

Address http://www.maktoob.com/index.pl?mm=39851188439851188 4 Go

- الحكم في المغرب على إسلاميين بالاعدام
- هجوم على معبد هندوسي في الهند
- مبتكر فيروس ساسر امام المحكمة
- الرياضة : وزير بريطاني: باريس لا تزال الأوفر حظا
- تكنولوجيا : مبتكر فيروس ساسر امام المحكمة

القاموس
أدخل كلمة Go
اقرأ صحيفتك
إختر صحيفتك

صبروك... لدينا فائز

هل تعتقد بأن العائلة المحافظة نعمة أم نقمة؟

- ألعاب نوكيا> العب على موبايلك أو اهدها لأصدقائك اضغط هنا
- بنك المعلومات> اختبر معلوماتك واربح جرة الكنز اضغط هنا
- مبروك> عرض خاص لتفتح قلبك...! اضغط هنا
- بطاقات معايدة> بطاقات حب وكلمات الأغاني المعبّرة! اضغط هنا
- بريد مكتوب> أكبر صندوق للرسائل على الشبكة في العالم! اضغط هنا
- نكت> هل تريد أن تضحك من قلبك؟ إذهب الآن إلى نكت! اضغط هنا

تحت الأضواء
هل تريد أن تضحك من قلبك؟ إذهب إلى نكت مع مكتوب لتقرأ، وتشارك، وترشح النكتة التي تعجبك

خدمات أخرى
سجل أنا عربي | ألعاب نوكيا
صمم بطاقاتك | شارك بنكتة
أرشيفات مكتوبية | الفائزون
دليل التلفزيون | غرف الدردشة

PC 2 PHONE




# کۆمەڵێک سایتی تایبەت بە دابەزاندنی پێناسەی پارچەکانی ئامێری کۆمپیوتەر

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:
فلۆرا عەلی

**DVD Drivers**
**http://www.cdrom-drivers.com**

**Graphics Drivers**
**http://www.video-drivers.com**

**Input Drivers**
**http://www.input-drivers.com**

**Modem Drivers**
**http://www.modem-drivers.com**

**Monitor Drivers**
**http://www.monitor-drivers.com**

**Mouse Drivers**
**http://www.input-drivers.com**

**Network Drivers**
**http://www.network-drivers.com**

**Plotter Drivers**
**http://www.printer-drivers.com**

**Windows XP Drivers**
**http://www.windowsxp-drivers.com**

**Printer Drivers**
**http://www.printer-drivers.com**

**Scanner Drivers**
**http://www.scanner-drivers.com**

**Sound Drivers**
**http://www.soundcard-drivers.com**

**Storage Drivers**
**http://www.storagedrivers.com**

**USB Drivers**
**http://www.usb-drivers.com**

**Video Drivers**
**http://www.video-drivers.com**

# چۆنێتی رێگە گرتن لە دزە کردنی چەتەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بۆ ناو ئامێرەکەت

سـەرەتا زۆر کەس لە ئێمە ترسـی ئەوەی هەیە کە لە ژێر چاودێری کەسـانی تردا بێت و ترسـی ئـەوەی هەیە کە خەڵکانێک هەن دزە دەکەن بۆ نـاو ئامێرەکەتان و زانیاری لە ئامێرەکەتان ببات جا بۆ ئەو مەبەسـتە دەتوانن رێگا لەو دزە کردنە بگرن بە ئەنجامدانی ئەم چەند هەنگاوە بۆ داخستنی ئەو پۆرتانەی کە لە ناو هەموو ئامێرێک دا هەیە ( الثغرات الامنية).

ئامادەکردنی: ئاشتی

تـکام وایـە هەنـگاوەکان وەکوو خۆی ئەنجام بدەن سەرەتا بچۆرە سەر لیسـتی START و لەوێشەوە بچۆرە سـەر فەرمانی RUN و ئەم نووسـینە بنووسـە .COMMAND COM سەیری وێنەی ژمارە (١) بکە پەنجەرەیێکـت بـۆ دەردەکەوێت ئـەم نووسـینە بنووسـە PING




وێنەی ژمارە (١)




وێنەی ژمارە (٢)

HOST و دواتر کلیلی ئینتەر ENTER دابگرە و چاوەڕوان بکە و دواتر دیسان ئەم نووسینە بنووسە PING PORT و دواتر کلیلی ئینتەر ENTER دابگرە و چاوەڕوان بکە و دواتر دیسان ئەم نووسینە بنووسە PING PORT 1027 و دواتر کلیلی ئینتەر ENTER دابگرە و چاوەڕوان بکە و دواتر دیسان ئەم نووسینە بنووسە PING PORT80 و دواتر کلیلی ئینتەر ENTER دابگرە و چاوەڕوان بکە و دواتر دیسان ئەم نووسینە بنووسە PING PROXY و دواتر کلیلی ئینتەر ENTER دابگرە و چاوەڕوان بکە و دواتر دیسان ئەم نووسینە بنووسە PING PORT و دواتر کلیلی ئینتەر ENTER دابگرە بەم شێوەیە کۆتایی بە داخستنی پۆرتی سەرەکی لە برۆکسی تایبەتیەکەی خۆت دێنی و بەربەستێک دادەنێن لەبەردەم ئەو کەسانەی کە بیانەوێ دزە بکەن بۆ ناو ئامێرەکەتان .

سەیری وێنەی ژمارە (٢) بکە

# پیشاندانی ناو و ڤێرژنی ویندۆز لەسەر ڕووبەری شاشە Disktop

زانکۆ ئەسعەد تەها

لە ویندۆزەکانی پێشوتردا لەسەر دیسکتوب ناوو ڤێرژنی ویندۆز نیشاندەدرا بەلام لەم ویندۆزە نوێ یانە وەک ME و XP ئەمە لابرا، بۆ ئەوەی ناو و ڤێرژنی ویندۆز لەسەر دیسکتۆپ ببینین پێوستە ئەم هەنگاوانە بکەین:

١- کلیک لەسەر (START) دەکەین وەپاشان (RUN).

٢- لەناو(RUN) دەنووسین (REGEDIT)،وەپاشان ویندورزێک دەکاتەوە بەم شێوەی خوارەوە:

٣- پاشان کلیک لەسەر هێمای (+)ی فۆلدەری(HKEY_CURRENT_USER) دەکەین وەپاشان کلیک لەسەر (CONTROL PANEL) وە ئینجا لەسەر (DESKTOP) وە لەلای دەستە ڕاست دەبل کلیک لە سەر کلیلی (PAINTDESKTOPVERSION) دەکەین و ژمارەی (٠) دەگۆڕین بۆ (١) .

پاشان (REGEDIT) دابخەوە کومپیوتەرەکەت(LOG OFF) بکەپاش ئەوەی کومپیو تەرەکەت لۆگ ئوف بوو وە هاتەوە ناو ویندۆز دەبینت کە ناوی ویندۆز و ڤێرژنەکەی لەلای دەستە ڕاستدا نزیک شریتی مەهام بە دیار دەکەویت.




وێنەی (١)




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

# وای فای بەرەو کوێمان دەبات؟

ئامادەکردنی: بژار نوری سعید

وای فای (WI-FI) کورتکراوەی WIRELESS FIDELITY یە، واتە پەخشی بێ تەلی زۆر وردو خێرا، ئەو تەکنیکەیە کەوا زۆربەی نوێیەکانی بێ تەل بەکاری ئەهێنن، لەجیاتی تەل و کێبڵ شەپۆلەکانی ڕادیۆ بەکار ئەهێنێ، توانای ئەوەی هەیە دیوارو بەربەست ببینێ.

بڕوانە وێنەی ژمارە (١)

وای فای ئێستا وەک ئامێرێکی بێ تەل و ئامرازێک لە دروست کردنی تۆڕی کۆمپیوتەری بێ تەل بەکاردێت، بۆ بەستنەوەی کۆمپیوتەر بەیەکەوە وە یارمەتی بەکارهێنەر دەدات بۆ پەیوەندی کردن بە ئەنتەرنێتەوە لە هەرشوێنێک خاڵی بەیەک گەیاندنی (WAP) بێ تەلی لێ بێت.

WAP کورت کراوەی WIRELESS ACCESS POINT ئەوە مانای خاڵی گەیاندنی بێ تەل ئەگەیەنێت، ئەمە ئامێرێکە توانای بەیەکەوە گرێدانی ئەو کۆمپیوتەرانەی هەیە کە وای فای WI-FI تێدایەو تۆڕێکی بێ تەل لە نێوانیاندا دروست دەکات و توانای ئاڵ وگۆڕکردنی داتای هەیە وە لەهەمان کاتدا لەوانە خۆی بەسەرچاوەیەکی بەتەلەوە بەسترابێت.

بڕوانە وێنەی ژمارە (٢)

شارەزایان وای بۆ ئەچن کەوا سەدەی بیست و یەک سەردەمی زانیاری دووەم بە خۆیەوە ببینێ، ئینتەرنێت و سەرچاوەکانی گەیاندن لە هەموو شوێنێک و کاتێک لەبەر دەست دابێت، پێشتر وا ئەزانرا کەوا مۆبایل لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەو کارە بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی ئینتەرنێت لە ڕێگای مۆبایلەوە گرانەو هێواشە، بۆیە ئێستا بە هەزاران کەس لە ئەمەریکا و جیهاندا لە ماڵ و کۆمپانیاو

وێنەی ژمارە (١)

وێنەی ژمارە (٢)



وێنەی ژمارە (٣)

شوێنە گشتیەکان وای فای بەکاری ئەهێنن.

بڕوانە وێنەی ژمارە (٣)

باشیەکانی وای فای زۆرن، لەمانە:

١-پێویستی ئامادەکرنی تۆڕەکانی ئاسان و خێراو هەرزانە، چونکە پێویستی بە دیوار هەڵکۆڵین و کێبڵ ڕاکێشان نیە.

٢-ئەتوانرێ ئامێرەکان بە هەموو ئاڕاستەکان بجوڵێن، هەڵبگیرێت و بە بەردەوامیش پەیوەندی هەبێت لەگەڵ ئینتەرنێت، بۆیە مرونەی زۆرە و بەرهەمیش زیاد ئەکات.

٣-لەزۆربەی شوێنە گشتییەکان بەکار ئەهێنرێ، لەکاتی سەفەردا و لە نەخۆشخانە، ....هتد.

٤-خێرایی پەیوەندی لەگەڵ ئینتەرنێت ئەگاتە ٥٤ میگا بایت لەیەک چرکەدا. بۆ ئەوەی کۆمپیوتەر بتوانێ وای فای بەکار بهێنێ، پێویستە تەکنیکی وای فای تێدا بێت، زۆربەی لاپتۆب و PDA و TABLET PC ئێستا کارتی وای فای تێدایە.

٥-شێوازی پەیوەندی کۆمپیوتەر لەگەڵ تۆڕەکانی وای فای زۆر ئاسانە، چونکە کارتی وای فای پرۆگرامی تایبەتی لەگەڵدایە و خۆی بەدوای تۆڕی وای فای ئەگەڕێت، هەر کە بیدۆزێتەوە پەیوەندی دروست ئەکات.

## تەکنیکی وای فای:

وای فای پاڵپشتی ئەو ئامێرانە ئەکات IEEE 802.11، جۆرەکانی ئەم ستارنداردەش بریتین لە:

١- 802.11B فریکوێنسیەکەی 2.4 GHZ بەو خێراییەکی ١١ مێگابیت لەیەک چرکەدا.

٢- 802.11A فریکوێنسیەکەی 5 GHZ بەو خێراییەکی ٥٤ مێگابیت لەیەک چرکەدا

٣- 802.11G فریکوێنسیەکەی 2.4 GHZ بەو خێراییەکی ٥٤ مێگابیت لەیەک چرکەدا.

بە بەردەوام ئامێری نوێ دروست ئەکرێ تاوەکو گەشە بەم تەکنیکە بدات، زۆر بە خێرایی گەشە ئەکات و ڕۆژانە شتی نوێی لێ دێتە کایەوە.

وابڕوات، ئێمەش لە کوردستاندا لەم تەکنیکە بێ بەش نابین، یاخود پێویستە لە ئێستاوە بیری لێ بکەینەوەو، ئەگەر ئەمڕۆ بەکاری نەهێنین، ئەوا لە دواڕۆژێکی زۆر نزیکدا بەکاری ئەهێنین.

بڕوانە وێنەی ژمارە (٤)



وێنەی ژمارە (٤)

# دانانی وێنه له تایبه‌تمه‌ندیه‌كانی MyComputer

ئه‌ژێ عه‌زیز
كۆلێژی په‌روه‌رده-به‌شی كۆمپیوته‌ر



وێنه‌ی (٢)



وێنه‌ی (١)

كاتی له‌سه‌ر " MYCOMPUTER "كلیكی ڕاست ده‌كه‌ین " PROPERTIES " هه‌ڵده‌بژێرین، بۆ ئه‌وه‌ی زانیاری ده‌رباره‌ی كۆمپیوته‌ره‌كه‌ت بزانی له ڕووی خێرای پرۆسیسه‌ر، و ڕام وجۆری ویندوز بزانین كه‌به‌م شێوه‌یه ده‌رده‌كه‌وێت:

بۆ دانانی وێنه‌یه‌ك له ناو ئه‌م شوێنه ئه‌م هه‌نگاوانه جێبه‌جێ بكه:

١- به‌رنامه‌ی "PAINT" بكه‌وه ڕه‌سمێك له‌ناوی دروست بكه یان به‌هۆی "OPEN"بهێنه،پاشان وێنه‌كه بچووك بكه‌وه به‌حه‌جمی ١٦*١٦ خه‌زنی بكه به‌ناوی "OEMLOGO. BMP" له‌م شوێنه "C:\WINDOWS\SYSTEM32".

٢- پاشان به‌رنامه‌ی "NOTEPAD" بكه‌وه فایلێك دروست بكه‌و ئه‌م كۆده‌ی له ناو بنوسه:

```
[GENERAL]
MANUFACTURER=BIOS
MODEL=PENTIUM 4 FULL
CACHE
SUPPORTURL=HTTP://WWW.
AZHYNET.I8.COM
[SUPPORT INFORMATION]
"LINE1="YOUR INFORMATION
" LINE3=" YOUR INFORMATION
" LINE4=" YOUR INFORMATION
```

پاشان ئه‌م فایله به ناوی " OEMINFO.INI" له " C:\ WINDOWS\SYSTEM32 " خه‌زن ده‌كه‌ین، پاشان ئه‌نجامه‌كه‌ی ده‌بینین به‌م شێوه‌یه:



وێنه‌ی (٣)

# زیادکردنی رووبەری خەزن کردنی هارد دیسک بۆ دوو بەرامبەر

وەرگێرانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی
نبیل عبدالرزاق فتاح*



ئەگەر هاردێکمان هەبێت بۆ نموونە رووبەرەکەی 3GB بێت، دەتوانین بەهۆی بەکارهێنانی ئەم رێگایە زیادی بکەین بۆ نزیکەی 6GB، ئەم رێگایە سوود بەخشە بۆ ئەوانەی کێشەیان هەیە لە کەمی رووبەری خزن کردن، بۆ ئەوانەش کە حەز بکەن رووبەری خەزن زیادتر بکەن بۆ خۆیان، ئەم کردارەش بەم جۆرەیە:

پێویستمان بە بەرنامەی نۆرتۆن گۆست ٢٠٠٣ دەرچووی (٢٠٠٣,٧٧٥) لەگەڵ هاردێکی تر.

هاردی خۆمان ناو دەنێین (T)، ئەوەی تریش ناودەنێین (X).

١. هاردی T دەکەینە ماستەر و ئەوەی تر X دەکەینە سلەیف، ئەم کردارەش روون کراوەتەوە لەسەر رووی هارد چۆن دەکرێتە ماستەر و سلەیف.

تێبینی: دەبێ فۆرماتی هەردوو هاردەکان لەجۆری سیستەم وەک یەک بن (FAT 32 بۆ FAT 32 یان NTFS بۆ NTFS).

٢. کۆمپیوتەرەکەت داگیرسێنە بۆ ئەوەی دڵنیابیت هەردوو هاردەکە خوێندراوەتەوە، ئێستا CD تایبەت بە بەرنامەی نۆرتۆن گۆست دابنێ و کۆمپیوتەرەکەت RESTART بکەوە.

٣. بەرنامەی نۆرتۆن بکەرەوە، فەرمانی GHOST BASIC هەڵبژێرە، پاشان BACK UP بۆ هاردی T پارچەی (C: \) هەڵبژێرە، پاشان بۆ خەزن کردنی فایلی BACK UP واتە TARGET هاردی X دەست نیشان بکە و ناوێک بۆ فایلەکە دابنێ، NEXT لێ بدە تاوەکو داوای RESTART دەکات.

٤. (هەنگاوێکی گرنگ) کاتێک کۆمپیوتەرەکەت دەیەوێت پێ ببێت، لەکاتی سەرتایی داگیرسانی بیکوژێنەوە بە داگرتنی دووگمەی پاوەر.

٥. شێوەی هاردی T لە ماستەرەوە بگۆرە سلیەف، هاردی X لە سلەیفەوە بگۆرە بۆ ماستەر. کۆمپیوتەر دابگیرسێنە CONTROL PANEL بکەرەوەو پاشان ADMINISTRATIVE TOOLS ئنجا COMPUTER MANAGEMENT ئنجا DISK MANAGEMENT ئێستا دەبینی پارچەیەک زیاد بووە لەسەر هاردی T بەناوی VPSGH BOOT.

٦. ئەم رووبەرە دەست نیشان بکەو فۆرماتی بکە.

٧. ئەوەی لەسەر هاردی T دەبینی:

أ. پارچەکانی کۆن.

ب. پارچەی نوێ.

٨. ئێستا پێویستت بە هاردی X نەما و لای بدە.

٩. هاردی T پارچەیەکی تازەی دەست لە رووبەری خەزن، ئاگادار بە هیچ شێوەیەک ئەم پارچە تازەیە تێکەڵاوی پارچەکانی تر بکەیت، بۆ نموونە ئەگەر پارچەکانی خۆی سەرەتایی دوو پارچە بێت، ئێستا سێ پارچەیە. نەکەیتە دوو یان چوار.

ئەم کردارە وا باشە لەسەر هاردێکی نوێ ئەنجامی بدەی بۆ ئەوەی زانیاری لەدەست نەدەیت.

چەند نموونەیەکی کرداری بۆ ئەم رێگایە:

هاردی جۆری ئای بی ئێم GB 80 زیاد کراوە بۆ GB 150.

هاردی جۆری ماکستور GB 40 زیاد کراوە بۆ GB 80.

هاردی جۆری سیجیت GB 20 زیاد کراوە بۆ GB 30.

---

*پەیمانگەی تەکنیکی سۆران – سەرۆکی بەشی سیستەمی کۆمپیوتەر

سەرچاوە: WWW.RO3H.NET



وێنەی ژمارە ١




# نهێنییەکانی وینذۆز

بێستون عمر

١- بۆکردنەوەی فەرمانی کارپێکردن RUN پەنجە بنێ بە نیشانەی پەنجەرە لە سەر کیبۆرد لەگەڵ R ‏(WIN+R).

٢- بۆ داواکردنی یارمەتی HELP لە سەر کیبۆردەکە پەنجە بنێ بە نیشانەی پەنجەرە لە گەڵ F1 + WIN

٣- بۆکردنەوەی WINDOWS EXPLORER پەنجە بنێ بە هێمای پەنجەرە لەگەڵ پیتی E لە سەر کیبۆردەکە (WIN + E).

٤- بۆ هێنانانە خوارەوەی بەرنامەکان بۆ سەر شریتی ئەرک بەیەکەوە ئەوا لە سەر کیبۆردەکە پەنجە بنێ بە هێمای پەنجەرە لە گەڵ پیتی (WIN + M)

٥- بۆ گەڕان بەدوای هەرفایلێک یان فۆڵدەرێک (WIN + F)

٦- بینینی فایلەکان لەسەر شریتی ئەرک (WIN + TAB)

٧-بۆدەرکەوتنی تایبەتمەندیەکانی سیستەم (WIN + BREAK)

٨- بۆ سڕینەوەی هەر فایلێک بەیەکجاری (SHIFT+DELTE)

٩- ئەگەر سیدیەک ئۆتۆڕەن بوو بتەوێ نەچێتە ناو ئۆتۆڕەنەکە لەکاتی دانانی سیدیەکە بۆماوەی سێ چرکە پەنجە بنێ بە (SHIFT)

١٠- ئەگەر کۆمپیوتەرەکە هەڵەی تێدابوو بۆ ئەوەی بچێتە SAFE MODE بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە لەگەڵ داگیرسانی کۆمپیوتەرەکە پەنجە بنێ بە (CTRL).

١١- کردنەوەی بەرنامە بە هاوکاری کیبۆرد لەسەرەتادا بچۆرە سەر تایبەتمەندیەکانی بەرنامە دوایی لە شوێنی SHORTCUT KEY بە ئارەزوی خۆت پیتێک هەڵبژێرە بڕوانە وێنەی ژمارە (١) ئینجا بۆ هەرجارێک) پیتی مەبەست (CTRL + ALT)

١٢- بۆ ئەوەی بە خێرایی بگەیتە تایبەتمەندیەکانی هەر فایلێک یان بەرنامەیەک پەنجە بنێ بە ALT دوو کلیک بکە لەسەری .

١٣-بۆ ئەوەی ٢٣ میگابایت بگەڕێتەوە بۆ ناو کۆمپیوتەرەکەت لە فەرمانی RUN بنوسە C:\WINDOWS\HELP دوایی کلیک بکە لەسەر OK لە پاشان هەموو ئەو فایلانە بسڕەوە، ئەوانی کەمانەوە وازیان لێبێنە .

# بڵاوبوونەوەی کۆمپیوتەرو فراوان بوونی بواری بەکارهێنانی لە هەرێمی کوردستان



هەر لەسەرەتای نەوەدەکان و هاوکات لەگەڵ ئەو پێشکەوتنە گەورانەی کەلە بواری دروستکردنی هاردوێرو سۆفتوێر ڕویداو وەک بڵاوبونەوەی WINDOWS 3.1 و پرۆگرامەکانی ئۆفیس کە قۆناغێکی گەورەی بەرەوپێشچوون بوون لە ڕووی ئاسانتر کردنی بەکارهێنانی ویندۆزو ئەو بەرنامانەی کەلەناو ناوەندی ویندۆز کار دەکەن، سەرەتای بڵاوبوونەوەی کۆمپیوتەرو بەکارهێنانی لە هەرێمی کوردستان.

هەمووومان ئەوەمان لە بیرە کە لەپێش ساڵی ١٩٩٠ دا کۆمپیوتەر تەنها لە کۆلیجەکانی زانکۆو، چەند فەرمانگەیەکی وەک پەروەدەی گشتی، ئامارو هەندێ فەرمانگەی تر کە لەژمارەی پەنجەکانی دەست دەرناچن هەبوو. کۆمپیوتەرەکانیش لە جۆرێکی نزم بوون کە نەئەتوانرا ئەو پرۆگرام و بەرنامانەی ئەوکات کەهەبوون و لە ناوەندی DOS کاریان ئەکرد بەکاربێنین، بۆ نموونە لەناوەراستی هەشتاکان کۆمپیوتەری (الورکا) کە لەکۆلیجەکان هەبوون، وا دروست کرابوون کە تەنها بەرنامەی BASIC بەکاربێنیت، دوای ئەوە لە کۆتایی هەشتاکان جۆرێکی تری (الورکا) هات کە هارد دیسکی ٢٠ مێگابایتی تێدا بوو وە سیستەمی DOS ی وەک ناوەندێکی کارکردن بەکاردەهێنا و هەورووەها هەندێ کۆمپیوتەری لە جۆری ٢٨٦ بۆ کۆلیجەکان هات کە ژمارەیان زۆر کەم بوون و بواری ئەوەیان نەبوو کە قوتابی بەکاری بهێنێ.

دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی ئاداری ساڵی ١٩٩١ کە هەرێمی کوردستان تێدا ئازادکرا، سەرەتایەک بوو بۆ ئازادی لە بواری کارکردن و

بەکارهێنانی زانستەکان وە بواری بەکارهێنانی کۆمپیوتەریش یەکێک بوو لەوبوارە زانستی یانە کە ئەم ئازادیەیان بە خۆوە بینی. هەر لە سەرەتای نەوەدەکان بەکارهێنانی کۆمپیوتەر لە فەرمانگەو دەزگاکان زیادی کردو بنەمای بازارێکی ئازاد و سەربەستیش بۆ بازرگانی کردن بەم ئامێرەو بەشەکانی پەیدابوو وە کۆمپیوتەرەکانی مۆدێلی ٣٨٦ دوای ئەویش ٤٨٦ هاتنە ناو بواری بەکارهێنان و وە لە دوای ١٩٩٦ دا مۆدێلی PENTIUM 1 کەوتە بازاڕی کوردستانیشەوەو لەبەر ئازادی لە بەکارهێنان و بازرگانی کردن مۆدیلەکانی تری پێنتیۆم یەک لە دوای یەک لە هەرێمی کوردستان بڵاوبوونەوەو کەوتنە بواری بەکارهێنان.

لە لایەکی دیکەوە ئازادی لەبەکارهێنانی بەرنامەکانیش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ سەرهەڵدانی بازرگانی کردن بە پرۆگرامەکان و هێنانیان بۆ ناو بازاڕی هەرێم و بڵاوبوونەوەیان وەک بڵاوبوونەوەی WIDOWS 3.1 و دواتر WINDOWS 95 دواتر WINDOWS 98 دواتر ویندۆز MELLINIUM وWINDOWS XP تاکو سەرەتای ٢٠٠٢ یەک لەدوای یەک کەوتنە بەکارهێنان و ڕێگە خۆشکەر بوون بۆ بەکارهێنانی پرۆگرامەکانی تری وەک OFFICE PROGRAMMS و PHOTOSHOP و AUTOCAD ...هتد. ئاسانی بەکارهێنانی ویندۆزو پرۆگرامەکانی کە لە ناو ویندۆز کاردەکەن وای کرد خەڵکێکی زۆر ڕوو بکەنە سەنتەرەکانی فێرکردن بۆ فێربوونی بەکارهێنانی ویندۆزو پرۆگرامەکانی.

ئێستا بازاڕی کۆمپیوتەر لە شارە گەورەکانی هەرێم شوێنێکی دیارو شەقامێکی دیارکراوی بۆ خۆی گرتووەو بازرگانیەکەش لەپەرەسەندن دایە.

## بەکارهێنانەکانی کۆمپیوتەر:

لەسەرەتای نەوەدەکان و سەرەتای بڵاوبوونەوەی کۆمپیوتەر لەهەرێم دا کۆمپیوتەر زیاتر وەک ئامێرێکی چاپکەر وابوو زۆر بەدەگمەن بۆ کۆکردنەوەو کۆگەکردنی داتاو شیکارکردنی بەکاردەهات، تەنها لەبواری ڕۆژنامەگەری نەبێت کە هەر لەسەرتاوە بەتەواوەتی لەم بوارە بەکارهاتووە. هەر لەوکاتەوە تاکو ئێستا گۆڕانێکی سستی بەخۆوە بینیوە لە بواری بەکارهێنانیدا.

لە کۆتایی نەوەدەکان کە سەرەتای بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بوو لە بواری بنکەی زانیاری و بەکارهێنانی بۆ سوود وەرگرتن لە ئنتەرنێت و دانانی تۆڕی کۆمپیوتەری بچووک لە هەندێ دام و دەزگاکان بووە هۆی فراوانکردنی بواری بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و زۆربوونی ژمارەی بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر لە هەموو فەرمانگەو دام و دەزگا حکومی نا حکومیەکان بڵاو بووەوە. شایانی باسە هەر لە هەمان کاتدا دروست بوونی چەند سەنتەرێکی فێرکردن لە ناو شارەکاندا کە ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە فێرکردن و بڵاوبوونەوەی هۆشیاری و ڕۆشنبیری تایبەت بەبواری بەکارهێنان و سوود وەرگرتن لە کۆمپیوتەر و پرۆگرامەکانی.

هەر لە کۆتایی نەوەدەکاندا وە لەبەر بڵاوبوونەوەی ئەنتەرنێت و ئازادکردنی لە هەرێمی کوردستاندا بەرە بەرە خەڵک ڕووی کردە فێربوون و بەکارهێنانی ئنتەرنێت لە بوارەکانی پۆستەو پەیوەندی کردن و کۆکردنەوەی زانیاری لە بواری زانستی و بازرگانی و ڕۆژنامەگەری و .. هتد بەمەش وەرچەرخانێک ڕوویدا لە ژمارەی بەکارهێنەران وشارەزایانی کۆمپیوتەر کە ژمارەیان زۆر زۆر زیادی کرد.

ئێستا لە هەموو فەرمانگەو دام و دەزگا حکومی ناحکومیەکان و بگرە لەماڵەکانیش کۆمپیوتەر هەیەو ژمارەی بەکارهێنەرانیش تارادەیەک زۆرە، بەڵام لەبەر نەبوونی تۆڕێکی کۆمپیوتەری فراوان WAN و نەبوونی کۆمپانیای تایبەت بە پێشکەشکردنی خزمەت گوزاری لەبواری پۆستی کوردی و خزمەتگوزاریەکانی بەکارهێنانی بازرگانی لە ناو هەرێمی کوردستان خەونێک و ئامانجێکی ترە بۆ زیاتر سوود وەرگرتن لەو ژمارە زۆرەی کۆمپیوتەر و بەکارهێنەرانی لەبواری زانستی و بازرگانی و گەیاندندا.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە تۆڕێکی کۆمپیوتەری فراوانی سەرتاسەری هەرێمی کوردستان دروست بکرێت و هەموو بەشەکان بەیەکەوە ببەستێتەوەو بە هەموو جیهانیشی بگەیەنێت ئەمە خۆی خاڵێکی وەرچەرخان دروست دەکات لە مێژووی بەکارهێنان و زۆربوونی بەکارهێنەری کۆمپیوتەر لە هەموو بوارەکانداو دەبێتە قۆناغێکی تری بەرەو پێشچوونی و ڕەنگدانەوەی ئەبێ لەسەر بوارەکانی ژیانی مرۆڤی کورد.

# ئامێری DIGITAL PLAYER MP4







بچوکترین ئامێرە لە جیهان کە خاوەنی چەند سیستەمێکی ڕەنگیە بۆ هەڵگرتن و نیشاندانی وێنەی ئاسایی هەموو سیستەمێکی دەنگ وەک (MP3.MP2.MP1.WMA.WM V.ASF.WAV) وەهەروەها توانای پێشاندانی هەموو جۆرەکانی وێنە و هەموو جۆرەکانی (ڤیدیۆ)ی هەیە بە جوانترین شێوە و هەر لەسەر ئەو شاشە بچووکەی کە ئامێرەکە هەیەتی وە هەروەها توانای هەیە فایلاتی کۆمپیوتەری و بەرنامەی لە ناودا خەزن بکرێت و وەکوو (فلاش میموری) بەکاربهێنرێت.

شایانی باسە ئەو ئامێرە نوێ یە کێشی تەنها ٣٠ غرامە وە دەتوانی لەگەڵ خۆتدا بۆ هەموو جیگایەک ببیەیت و دەتوانی لەسەر هەموو ئامێرێکی کۆمپیوتەر بەکاری بێنی وە قەبارەی ئەو ئامێرە زیرەکە بچووکە دەگاتە (1G) هەروەها ئەم ئامێرە بچووکە توانای بەکارهێنانی هەیە بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی و ئاسان .

وە بە پێچەوانەوە دە توانیت لەم ئامێرە وەرگری بابەتەکان وەک دەنگ تۆمارکردن چونکە ئەم تایبەت مەندیەی هەیە بۆ دەنگ تۆمارکردن، ئەم ئامێرەش ئێستا لە بازارەکانی خۆمان دەست دەکەوێت .




# GPRS چیه ؟

GPRS یەکێکە لەخزمەتگوزاریەکانی مۆبایل کورتکراوەی (کۆمەڵەی خزمەتگوزاری نێرەرە گشتیەکانە)و بریتیە لە ناوەندێکی یارمەتیدەر بۆ چوونە ناو ئەنتەرنێت و ناردن و وەرگرتنی زانیاری بەبێ ئەوەی پێویست بە پەیوەندی بکات بۆ هەموو جارێک وە بە هۆی GPRS دەتوانیت بەردەوام لەپەیوەندی دابیت . ئەم سیستەمە بەوە ناسراوە کە زۆر ئابوریە بەنیسبەت بەکار هێنەرەکە لەبەر ئەوەی حسابی کارکردن لەسەر کات نیە بەڵکو لەسەر وەرگرتنی ئەو زانیاریانەیە کە بەکارهێنەر وەری دەگرێت و دادەبەزێنێتە ناو کۆمپیوتەرەکە بەمەش دەتوانیت



بۆ ماوەیەکی زۆر پەیوەندی بەئەنتەرنێتەوە نەبڕیت .یەکێک لە جیاکەرەوەکانی ئەم سیستەمە ئەوەیە کە دەتوانیت ٢٤ کاتژمێر لە پەیوەندی دابیت تەنها نرخی تێچوش ئەوەستێتە سەر قەبارەی ئەو زانیارانەی کە داتبەزاندون بۆ ناو کۆمپیوتەرەکەت، خێرایەکی زۆر باشی هەیە و بەگوێرەی جۆری مۆبایلەکەش دەگۆڕێت وە خێرایەکەشی سێ ئەوەندەی تۆڕی مۆبایل دەبێت جگە لەمەش ژمارەی بەشداربوانیش کاریگەری دەبێت لەسەر خێرایی گۆڕینەوەی زانیاریەکان.

دەتوانرێت زۆر بەئاسانی هاوبەشی بکەیت ئەگەر ئەم خزمەت گوزاریە لە ناو تۆڕی مۆبایلەکە هەبێ کەبریتیە لە پرۆتوکۆڵێکی ئەنتەرنێت لەگەل تۆڕی GSM.

گونجاوترین خزمەتگوزاری GPRS بریتیە لە گفتوگۆکردن (دردشـــة) وە کورتە نامە خزمەتگوزاریەکانی تری ئەنتەرنێت. وە دەتوانرێ زۆر بەئاسانی بەکۆمپیوتەرەوە ببەسترێتەوە بۆ وەرگرتنی زانیاریەکان.

جگە لەمەش دەتوانین بەخزمەتگوزاریەکانی GPRS نامەی ئەلیکترۆنی و نامەی دەنگی بنێرین و زۆر بە ئاسانی خزمەتگوزاریەکانی ئەنتەرنێت بەکار بێنین.



# ڕێگایەک بۆ کۆگا کردنی ٨٠٠٠ نامە لە نۆکیای ٦٦٠٠




لە ڕێگای ئەم هەنگاوانە دەتوانیت ٨٠٠٠ نامـە لـە نـاو مۆبایلەکـەت هەڵگریت و لەناوچون بیانپارێزین بـۆ ئەم مەبەسـتە ئەگـەر ئارەزو دەکەیت ئەم هەنگاوانە پەیڕەو بکە : بچۆ نامە (MESSAGING) لە لیستی سەرەکی نامەدا خیارات OPTIONS هەڵبژێـرە لـە دوایـدا الضبـط SETTINGS ئینجـا اخری OTHER هەڵبژێـرە پاشـان بچـۆرە سـەر الذاکرة المسـتخدمة MEMORY IN USE ئینجا میمۆری کارت هەڵبژێرە کارت الذاکـرة MEMORY CARD لـە دواییـدا داوات لێـدەکات کـە نامەکانـت بگوازیتەوە بۆ ناو کۆگا نوێیەکە (کارت الذاکرة MEMORY CARD) پاشـان داوات لێدەکات کە نامە بنەڕەتیـەکان بپارێزێ یاخود نا .

٨٠٠٠ نامـە بـۆ کۆگایـەک بـە قەبـارەی ٣٢ مێگابایت ئەگەر بێت و بەتـاڵ بێـت بـەڵام وادادەنێیـن کەتـۆ ١٠ مێگابایـت بـەکار دێنیت بـۆ بەرنامـەو وێنـەو فایلەکانـی تر بەمـەش دەتوانیـت ٥٠٠٠ نامە هەڵگریت . بەڵام ئەگەر ٢٠ مێگابایتت بەکارهێنابێت بـۆ بەرنامەو وێنەو فایلەکانـی تر ئەوا دەتوانیت ٢٦٠٠ نامە هەڵگریـت . دوای هەموو ئەو کارانەی سـەرەوە لەکاتـی داوای پاراسـتن دەکات لە نـاو کۆگای ٦ مێگابایـت مەیپارێـزە بەڵکو لەناو کارت الذاکـرة MEMORY CARD بپارێزە واتا سەیڤ کردن .

# مۆبایلێکی نوێ دەنگ ئەگوازێتەوە بۆ دەق و ئەینێرێ




وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: ئاوات

کۆمپانیای سامسۆنجی کۆریایی باشوور ئاشکرای کرد کەدوو مۆبایلی داهێناوە کە دەنگی بەکارهێنەرەکانیان وەرئەگێڕێ بۆ دەق،ئەوەش لەپێش کەوتنێکدا لەمەودوا ڕێ ئەدا کە مۆبایل بەئاسانی ئەنتەرنێت وەربگرێ،بەکار هێنانی تە لەفۆن بۆناردنی نامەی کورت بەتۆڕی گرێدەر (شبکة متنقلة) لەجیاتی نوسینی پیتەکان لەسەر دوگمە بچوکەکانی سەر مۆبایلە کەخاوەنەکەی ئەتوانێ ناو نیشانی ئەلکترۆنی و ناوەڕۆکی نامەکەی بە دەنگ پێ ڕابگەینێ هەر وەکوو ڕۆژنامەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست (الشرق الاوسط) ڕایگەیاندوە، مۆبایلەکەش لە جۆری (P207)ە لەولایەتە یەکگرتوەکان بە (٨٢) دۆلار دەفرۆشرێ لەلایەن کۆمپانیایێ کڕیار گرێ بەستی لەگەڵ ئەکا بۆ ماوەی دوو ساڵ، سامسۆنگیش بە(١٨٠) دۆلار خستویەتیە بازاڕوە، جۆری دووەمیش کە (800A) لە ماوەیەکی نزیکدا دەکەوێتە بازاڕەوە.

## ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس هەولێر بەرامبەر قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

تێبینی :

*هەر بابەتێک بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .

* هەر بابەتێک لە شوێنێک یان گۆڤارێکی تری کوردی بڵاوکرابێتەوە ئێمە بڵاوی ناکەینەوە.

* بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بڵاوکردنەوە ئەوا ناگەڕێتەوە.

*هەر کەسێک بابەت ئەنێرێ بۆ بڵاو کردنەوە با بابەتەکەی لەسەر فلۆپی دێسک یان فلاش میموری بێت و وێنەی ڕوونکەرەوەکان بەجیا لە نێو فولدەرێک دا بێت و بابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.



# ململانێی نەتەوەکانی ژاپۆن وچین لەڕێی ئەنتەرنێت

وەرگێڕان لە عەرەبییەوە: دایکی سارا

لەسەرەتای دەرکەوتنی ئەنتەرنێت، هەندێ لەبیر دۆزەکان ووتیان ئەم جیهانە نوێیە کەسنور ئەبڕێ دەوڵەتەکان وسنورە تایبەتەکان بەنەتەوایەتی کەم ئەکاتەوە·

بەڵام بۆچونەکان هەموو جارێ ڕاستی دەرناچن· تەنها لەسەر ئەرزی واقع نەبێ، ئەوەتا پسیۆڕی چین کەلەهەموو کاتێکی ڕابردوو کراوەترە، پێچەوانەی ئەم قسانەی دەرخستووە، کاتی لاوانی چین هەر چەند زیاتر بچنە ناو جیهانی ئەنتەرنێتەوە، زیاتر دەست بەنەتەوایەتی ئەگرن و بە شێوەیەکی ترسناک، بەڕادەیەک کاری کردۆتە سەر هەوڵەکانی بەرپرسەکانیان بۆچاک کردنی پەیوەندی لەگەڵ ژاپۆن· ئەوەی گرفتەکە ئالۆزتر ئەکات ئەوەیە کەلاوانی ژاپۆن بڵێسەی ئاگرەکە خۆشتر ئەکەن ·

هەست کردن بە دوژمنایەتی نەتەوەی ژاپۆن لەنێو لاوەکانی چین کارێکی زۆر گرانە و بەشێوەیەکی خێرا لەپەرە سەندن دایە ·وەپسپۆرەکان وای ئەبینن کەکرانەوەی چین و زۆری بەکار هێنانی ئەنتەرنێت ڕۆڵێکی سەرەکیان بینیوەلەم کارەوسەرەتای کێشەکەش شەڕی ململانێ بوولەسەر جێگا (مقعد)ی هەمیشەیی لەئەنجومەنی ئاسایش،چینەیەکان لەلای خۆیانەوە هەستان بەکۆکردنەوەی ئیمزای بەرهەڵستی ئەم خواستە، سەرەتایی ئەم کارەش بەهەڵمەتێکی فراوان لەلایەن چینە نیشتە جێکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان بوو بۆکۆکردنەوەی نزیکەی ملیون ئیمزا، وڕێکخەرانی هەڵمەتەکە ئەڵێن کە بەکارهێنانی ئەنتەرنێت لەچین ژمارەی ئیمزاکانی گەیاندە زیاتر لە (٢٢) ملیۆن.

ئیمزاکەران بەوئومێدەن بتوانن پاڵ بە پەکەین بنێن تا ژاپۆن لەدەرەوەی ئەنجومەنی ئاسایش بهێڵێتەوە، بەڵام ئەم بزاڤە چینیە چالاکە بووەهۆی تێک دانی پەیوەندی نێوان هەردوو دەوڵەت، لەڕاستیدا چینیەکان پەستی پیش خواردنەوەی خۆیان بەرامبەر ژاپۆن دەربڕی· بەڵکو بەرگریان لەوڕایەش ئەکرد کەداوای دابڕان ومامەڵە نەکردن لەگەڵ کەل وپەلی ژاپۆنی ئەکا،وەئیهانەی ژاپۆنیان ئەکرد لەمیانەی گفتووگۆ لە سەر ئەنتەرنێت و ژووری وتوو وێژ،وەداوایان لەکار بەدەستانیان ئەکردسیاسەتی خۆی بگۆڕی لەگەڵ ژاپۆن·

ولەلای خۆیەوە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا ئیدانەی بەرپرسە چینیەکانی کردو گوایە توانای جڵەوگرتنی ئەم بزوتنەوەی نیە لەدژایەتی کردنی ژاپۆن و حکومەتی چینیان بەوە تاوان بار کرد کەهەست بە بەختەوەری ئەکا لەپەرە پێدانی نەتەوایەتی چینی وەکو ئامرازێک بۆزیاد کردنی ئەو شەرعیەتەی هەیەتی· وپسپۆرەکانی کاروباری چینی وژاپۆنی،ئەوە دووپات ئەکەنەوە کەکار بەدەستان نارحەتن لەم بارەوە کەڕوو لە زیادبوونە·

# دەزگایەکی نوێ بۆ وەرگێڕانی ڕاستەوخۆ بۆ چەند زمانێک



وەرگێرانی لە عەرەبییەوە:
محمد علی عوزێری

کۆمپانیایی (ان .ئەی .سی) ژاپۆنی بەم دواییە توانی دەزگایەکی ئەلیکترۆنی بە پێوانەی ناو لە پێک بەرهەم بێنێ کە دەتوانێ ووشەکان بە دەنگ بۆ بەرامبەر وەرگێڕێ لە زمانی ژاپۆنیەوە بۆ زمانی ئینگلیزی وە بە پێچەوانەوە.

ئەم دەزگایە لە سێ بەش پێک دێ خولاوەیەک بۆ جیاکردنەوەی دەنگ وە بەرنامەیەک بۆ وەرگیران و داهێنانێک بۆ دەنگ و لە هەمان کات بە یەک لاکردنەوە و ناسینەوەی زمانی ژاپۆنی لە ئینگلیزی کە دوایی وەری دەگێڕێ وە بە پێچەوانەوە لە ڕێگای دارشتنی بەرنامەی وەرگێران لە کۆتایی دا ووشەکە بە دەنگێکی دروست کراوی پیشەسازی ئە م دەنگە (دەبیسترێت) کردارەکە گشتی لە یەک چرکەدا دەبێ و کۆمپانیایی ناوبراو ئێستا نمونەیەکی لەو ئامێرە بەر دەست خستووە لە زمانی ژاپۆنی کە زیاتر لە (١٠٠) سەد زاراوەی جۆراو جۆر لە خۆدەگرێ و وەردەگێرێ بۆ زمانی چینی.

ئەم دەزگایە بە سیستەمی ویندۆز کار دەکات و کاریش بۆ ئەوە دەکرێ کە بەم زوانە لە ڕێگایی مۆبایلەوە بەکاربهێنرێ و سودی لێ وەربگیرێ.



# عەمار ئازاد محەمەد

# دەتوانین لەڕێگایی ئەنتەرنێت کورد بەدنیا بناسێنین

دیمانە: ڕێناز حەویزی

بۆ ئاشنا بوونی خوێنەران و هۆگرانی ئەنتەرنێت بەزانینی جۆری سیستەمی کارو گرفتەکان و ڕۆڵی ئەنتەرنێت لەکوردستاندا لەنزیکەوە دیمانەیەکمان لەگەڵ بەڕێوەبەری هوتەری کوردستان نێت سازدا.

پ/ بۆ یەکەم جار کەی ؟وە چۆن ئەنتەرنێت گەیشتە کوردستان نێت؟

و/ بۆ یەکەم جار بەهۆی ویستگە بوو بەلام نرخی گەلێک گران بوو هەر یەکێک دەگەیشتە چوار هەزار تا پێنج هەزار دولار خەڵکی ئاسایی نەیان دەتوانی بەکاری بهێنن چونکە نرخ و بەژداری کردنی گران بوو سەبارەت بە کوردستان نێتیش لە ٢٠٠١/٣/٣١ دەستی بەبلاوکردنەوەی خۆی کرد .

پ/ ئەنتەرنێت تاوەکو ئێستا ع ڕۆڵێکی گێراوە لە کوردستان لەلایەنی سلبی و ئیجابی؟

و/لایەنە باشەکەی ئەوەیە دەتوانی بەم هۆیەوە پەیوەندی بە هەموو جیهان بکەی بۆ جیهان بسەلمێنی کە کورد هەیە هەر لەم ڕێگەیەوە کورد بە دنیا بناسێنین بۆئەوەی ئەوانیش وەک کەسانی دنیا پەیوەندی بەجیهانەوە بکەن و ئیمێلیان هەبێ.

پ/ ئەو کێشانەی کە تووشی تۆڕەکانتان دێن چین؟ گرفتان بۆ دروست دەکەن ؟

و/ گرفتەکان لەسەر کۆمپیوتەری یوزەر ڕادەوەستێ لەسەر بەرنامەکان و دژە ڤایرۆس زۆر جاریش کاتێک ڤایرۆس تووشی کۆمپیوتەرێک بێت لەوانەیە تووشی تۆڕەکە بەتەواوی ببێت ئەوجا ئەگەر دژە ڤایرۆسی لەسەر نەبێت ئەوا تۆڕەکە هەمووی تووش دەبێت بۆیە (یوزەر) واتە ئەوکەسەی کە ئەنتەرنێتی دەدەینێ دەبێت لەلای خۆی ڕەچاوی ئەوە بکات کە کۆمپیوتەرەکەی خاوێن بێت لە ڤایرۆسات ئێمە لای خۆمان (SERVER) ودژە ڤایرۆسمان لەسەر داناوە بۆئەوەی یوزەرێک ئەگەر خراپەکی هەبێت بۆ خۆی بگەڕێتەوە کاریگەری لەسەر ئەوانی تر نەبێت .

پ/ ڕێژەی بەژداربوانی ئەنتەرنێت لەلایەن کوردستان نێت تاوەکو ئێستا لە شاری هەولێر چەندە؟

و/ دوو سیستەممان هەیە سیستەمی (DSL ) کەڕێژەی بە ژداربوانی (١٥٠٠ ) یوزەر دەبێت نرخی مانگانەی (٤٥ $) ڕادەوەستێت لەگەڵ سیستەمی (DIAL-UP ) کەڕێژەی بەشدار بووانی (٣٠٠٠) تا (٣٥٠٠) یوزەربێت کەنرخی مانگانەی (٣٢$) دەوەستێت .

پ/ پرۆژەی ئەوەتان لەبەردەست دانیە کەلەداهاتوو کارێکی وا بکەن کەخەڵک بۆ ڕاکێشانی ئەنتەرنێت پێویستی بە تەلەفۆن نەبێت؟

و/ پرۆژەیەکمان هەیە کە لە ٢٠٠٦/١/١ دەست پێ دەکات پرۆژەکەش ئەوەیە کە بە (وایەر لێس) ئەنتەرنێت دابەش بکەین واتە هیچ پەیوەندی بەخەتی تەلەفۆنەوە نەبێت.

# سوودو زیانەکانی بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت

ڕیپۆرتاژ:
ڕێناز ئەردەلان بەکر

**ڕۆژانە ئێمە وەک دەبینین و دەبیستین کە ڕۆژ بەڕۆژ ڕێژەی بەکار هێنەرانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت لـە جیهانـدا لە بەرزبوونەوە دایە، لەکوردسـتانی خۆشـمان لەم یەک دوو سـاڵەی ڕابـردوو ژمارەی بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت ڕوو لەزیاد بوونە وەک دەبینین بەشێوەیەکی بەرچاو سەنتەرێکی زۆری ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر لەناو بازاڕو کوچەو کۆڵانەکانی شـارەکانی کوردسـتان بەدی دەکەین کە دەکرێ بپرسـین ئایا بۆچی بەکاری دەهێنن؟ ئایا لەلایەن بەکارهێنەرانی سـودی چیە و زیانی چیە ؟ بۆ ئەم مەبەستە ڕووی پرسیارم ئاراستەی چەند کەسانێک کرد کە بەم شێوەیە گوزارشتیان لەبۆچوونی خۆیان کرد.**



**سەرەتا بەڕێز عوسمان ڕانیەیی بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی هەرێم**

**بەم شێوەیە بوچونی خۆیی دەربڕی:**

ئەو بابەتەی ئێوە دەتانەوێ پرس و ڕای خەڵکـی لەسـەر وەرگـرن بابەتێکی زۆر گرنگـە بۆ ئەمڕۆیی ژیانـی خەڵـک خۆیـی لەخۆیـدا کۆمپیوتەر یاخـود ئەنتەرنێت بۆتە پێویسـتیەکی ژیانـی خەڵک ئەمڕۆ چـۆن خەڵـک بەدوایی خـۆراک دا دەگـەڕێ و بـە دوایـی ئامانجێکی گرنـگ دەگـەڕێ لەژیانـی خۆیدا، کۆمپیوتـەر دەتوانـێ هەمـوو ئەو شتانەی بۆ جێ بە جێ بکات بەڵام ئەگـەر بەدیوە ڕاسـتەکەی وەری بگرین تەواوکـەری کۆمپیوتەریش بێگومـان تۆڕەکانـی ئەنتەرنێتـە کەئێسـتا بەشێوەیەکی زۆر فراوان بـڵاو بۆتـەوە لەنـاو کۆمەڵگایـی خۆمانـدا. کۆمپیوتـەرو ئەنتەرنێت دەتوانیـن بڵێـن دوو لایەنـی هەیە لایەنـی بـاش و لایەنـی خـراپ، بۆنمونـە ئێمە لەبـواری ڕاگەیاندن ڕۆژانـە دەتوانیـن ئەنتەرنێت بکەینە سـەرچاوەیەکی باشـی بۆ کارەکانمـان بـۆ چەنـد بابـەت و بوارێـک بەکاردێـت بەتایبەتـی لە بواری هـەواڵ و ڕیپۆرتاژو دەنگ و باسەکانی دنیا کە ئەمە بۆ خۆیی ئاسـانکاریەکی زۆرو چاکـی بـۆ ئێمـە کردووە لەم بـوارەدا زۆر لە کارمەندانـی ئێمـەش لێـرە ئەنتەر نێت بەکار دەهێنن وەک پێویسـتی بەشـەکانیان یەک خـاڵ هەیە لێرە دەمەوێ باسـی لێوە بکەم ئەویش ئەوەیـە کە سانسـۆر نیە لە سـەر بەکار هێنانـی ئەنتەرنێت من ناڵێم سانسـۆر هەبـێ بەڵکـو دەمەوێ ڕێـک خسـتنێک یـان میکانیزمێک هەبـێ بۆ ئـەوەی ئەنتەرنێت چۆن بەکار دەهێنرێ لـە قاوە خانەکانی ئەنتەرنێـت چاودێریـەک هەبێ بۆ ئەوەی خەڵک توشـی لادان نەبێت چونکـە بـە بـەکار هێنانـی چەند دوگمەیـەک لەوانـە یـە خەڵک بۆ مە بەسـتی خراپ ڕابکێشـێ بۆیە پێویستە چوار چێوەیەکی کار کردن و میکانیزمی دیاری کراو هەبێت بۆ بەکار هێنانی ئەنتەرنێت .



**هەروەها خاتوو ڤیان عبدالخالق لە بەشی تێلێتێکست**

**لە تەلەفزیۆنی هەرێم گوتی:**

بە بۆ چونی من بە کار هێنانیان سودێکی زۆری هەیە من وەک کارمەندێک کاری کۆمپیوتەر دەکەم کارئاسانیەکی زۆری بۆ کردووین

بۆ بە ڕێوەچونی کارە کانمان بەکار هێنانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت هۆیەکە بۆ بەرەو پێش چونی وولات، وە لایەنی خراپی یاخود زیانی بە بۆچونی من زۆر نیە زۆر بە کارهێنانی کاریگەری دەروونی دەبێت لەسەر ئەو کەسەی کە زۆر بە بەردەوامی بەکاری دەهێنێت .



**بەر پرسی بەشی تەنسیق لەتەلەفزیۆنی هەرێم محەمەد شەریف**
**بەپێی بۆچونی خۆیی دەڵێ:**

لە دوایی ئازاد کردنی کوردستان لەساڵی ١٩٩١ کۆمپیوتەر بەشێوەیەک پەرەی سەند بەلام لەم یەک دوو ساڵەی ڕابردوودا کۆمپیوتەرو ئەنتەر نێت بەشێوەیەکی بەرفراوان بەکار دەهێنرێن، لە دام و دەزگایەکان و بگرە لەماڵەکانیش بەکاردێ کە ئەم پێشکەوتنە پێشکەوتنێکی ئیجابین بۆ بەرەو پێشەوە چونی وولات و سوودەکانی ئەوەن کە کارئاسانیەکی زۆر دەکەن بۆ دام و دەزگاکان لایەنی خراپیشی ئەوەیە کە کاتێک کەسێک زۆر بە قوڵی بەکاری دەهێنێ دەچێتە ناوەڕۆکی بابەتەکان و توشی ماندووبونێکی زۆری دەکات کەجۆرە ڕەنگ دانەوەیەکی سلبی دەبێت بۆلایەنی دەروونی کەسەکە چونکە کۆمپیوتەر وەک دەریایەکی قوڵی بێ کۆتاییە .

کۆمپیوتەر لەڕووی کاتەوە کاتێکی تەواوت بۆ کەم دەکاتەوە.



**زاهیر حمدامین کارمەندی بەشی مۆنتاژ**
**بەم شێوەیە هاتە دوان:**

خۆیی لە خۆیدا سیستەمی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت یەکێکە لە پێشکەوتوو ترین سیستەم کە لە جیهاندا هاتە کایەوە کەوەک شۆرشێکی پێشکەوتن خوازە لەجیهاندا کوردستانیش یەکێکە لەم شوێنەی کە ئەم پێشکەوتنەی بەخۆیەوە دیوە کە زۆربەی لایەنە گرنگەکانی دەزگاکان ئەم ئامێرە بەکاردەهێنن بە تایبەتی لە تەلەفزیۆن کە جیاوازی هەیە لەگەڵ پێشتر کە ئێستا بەرنامەی تەلەفزیۆن لەسەر مونتاژ دەکرێتەوە هەروەها لە لایەنی مۆسیقا ئێستا وەک بنەمایەکی سەرەکی بەکاردێت بۆ نموونە ئێمە لە م دەزگا یەدا لەسەر سیستەمی نوێی جیهانی کۆمپیوتەر کاردەکەین ئەم تەکنەلۆژیایە ئاسانکاری تەواومان بۆدەکات هەروەها بەکارهێنانی کۆمپیوتەر کاتێکی تەواوت بۆکەم دەکاتەوە لەڕووی کەم کردنەوەی هەروەها لەڕووی جوانی و جەمالیەتی کارەکان کە دەتوانی زۆرکارێکی جوان ئەنجام بدەی بەماوەیەکی زۆرکەم کارکردنی زۆر لەڕووی تەندروستی لایەنی زیانی دەبێت بە تایبەتی ماندووبونی مێشک و چاو .



**سارا فەتاح**
**بێژەر لە ڕادیۆی هەرێم ووتی:**

سوودەکانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ دەسکەوتنی زانیاری زیاتر زۆر شت هەیە کە هەندێک پێویستی هەیە کەلەوانەیە مرۆڤ لە توانای دا نیەبیکات بەکۆمپیوتەر دەکرێت هەرچەندە کۆمپیوتەر مرۆڤ دروستی کردووە ناتوانین بڵێین زیرەکترە زۆر بەکارهێنانی دەبێتە هۆی کاریگەری لەسەر مێشک و بیرو هۆش و کاردەکاتە سەر چاو.



**ڕابەر ڕزگار فەرمانبەر لە وەزارەتی ڕۆشەنبیری دەڵێت:**

کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت هەردووکیان سوودیان زۆرە بەڵام لە هەمان کاتیشدا لە سلبیات بەدەرنین زیانەکانیشی زۆر جار هەیە خەڵکانێک بۆشتی خراپ

بەکاری دەهێنن بۆ نموونە وەک شتی لاوەکی وەک لایەنی سێکسی بەکاردێت هەندێک جار بەشێوەیەکی وا بەکاردێت کە کاریگەری لەسەر تەندروستی دەبێت ئەو کەسەی بەشێوەیەکی زۆر و بە بەردەوامی ئاگای لە لایەنی کۆمە لایەتی نامێنێ لە گەل ئەوەشدا کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت سوودێکی زۆریان هەیە لەلایەنە ئیجابییەکەی.



**خاتوو سەمیرە نادر فەرمانبەری کار لە وەزارەتی ڕۆشنبیری بەم شێوەیە تیشکی خستە سەر ووتەکانی:**

هەروەک ئاگادارین ئێستا لە کۆمەلگاکەماندا بە کارهێنانی ئامێری کۆمپیوتەرو تۆڕی ئەنتەرنێت بۆتە شتێکی زۆر ئاسایی بگرە لە زۆربەی مالآنیشدا هەیە لە هەموو جۆرە تەمەن و ڕەگەزێکن سەبارەت بە سوودو زیانەکانی خالە گرنگەکان دەگەڕێتەوە بۆ کەسایەتی و بیرو باوەڕو ئاستی ڕۆشنبیری و ئامانجی ئەو کەسانەی یان ئەو لایەن و جیهەتەی کە بە کاری دەهێنین دەکرێ بلێین لایەنە باشەکان بریتین لە کارئاسانی ئەنجامدانی کار بە زووترین کات جیهانگیر یە واتە گشت دنیای بەیەک بەستۆتەوە وەک سەرچاوەیەکی سەرەکیە بۆزانیاریەکان باشترین و بە پەلە ترین ڕێگایە بۆ خوێندنی زانکۆ زیانەکانیشی بریتیە لە بەکارهێنانی بۆ مەبەستی خراپ بۆتە هۆی سەرقال کردنی کەسانێکی زۆر تەنیا بۆ کات کوشتن زۆر جار بۆ کاری نا یاسایی بەکاردێ لە ئیش و کاردا.



**محەمەد علی عوزێری ڕۆژنامەنووس بەم شێوەیە ئاماژەی بە ووتەکانی کرد:**

ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر وەک هەموو ئامرازێکی تر لەلایەن مرۆڤەوە دەتوانێ سوودی لێ وەربگیرێ بۆ لایەنە چاکەکەی هەمیشە ئەوەی ڕەچاو کراوە لە کوردستاندا زیاتر سوودی لێ وەرگیراوە بە شارستانی کاری لە گەل کراوە هەلبەتە جار بەجار بۆ کاری نادروست بە کار هێنراوە لە زۆر لایەن بە نموونە کردنی ئەنتەرنێت بە هۆکارێک بۆ پەیوەندی نێوان تیرۆرستان بەلام هەمیشە سوود بەخشتر بووە لە زیانبەخشی.

**ڕێژین عەلی دەرچووی پەیمانگا بەشی کۆمپیوتەر دەلێت:**



بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت کۆمەلێک لایەنی باش و خراپی هەیە لایەنە باشەکان کە کۆمپیوتەر وەک ئامێرێکی زانستی و هەستیارو سود مەند بۆ بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانی ڕۆژانە لە هەموو بوارەکاندا بە شێوەیەکی خێرا و بۆ ئاسان کاری کارەکانمان وەلایەنە خراپەکانی زۆر بەکارهێنانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت سەرەڕای ئازاردانی چاو و پشت زۆر بەکارهێنانی ئەنتەر نێت دەبێتە هۆیی بێزار بوونی دەورو پشتمان وە لەیاد کردنی کات .



**نیکار صابر فەرمانبەر لە وەزارەتی ڕۆشنبیری گوتی:**

کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت گرنگی و تایبەتمەندی خۆیی هەیە بە تایبەتی لەم کات و ساتە دا کە ئەم بوارە پێشکەوتنێکی بەرچاوی بە خۆیەوە دیوە وە ئێمەی کوردیش دەبێت لەگەلی بەردەوام بین،سودو زیانەکانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت بۆ خودی شەخصی دەگەڕێتەوە کە ئەم کەسە چۆن دەتوانێت ئەم ئامێرە بەکار بهێنێ بۆ نمونە ئەگەر باسی ئەنتەر نێت بکرێ دەتوانم ئاماژە بەوە بدەم کە ئەنتەر نێت شێوازێکی زۆر پێشکەوتووە بۆ پەیوەندی کردن لە هەر جێگە یەکی ئەم دونیایە بێت بە شێوەیەک کە دەگوترێت ئەم دنیایە بەهۆیی ئەنتەرنێتەوە وەکو گوندێکە کە خەلک بە زووترین کات و بە خێرایەکی زۆر دەتوانن کارە کانیان ئەنجام بدەن سودی لێ وەرگرن، بەلام هەندێک کەس بە پێچەوانەوە ئەنتەر نێت بۆ قسە پێ کردن و کات بەسەر بردن بەکار دەهێنن بەشێوەیەک کە لە بەیانیەوە تاوەکو کاتی نوستن بەردەوام کار بە ئەنتەر نێت دەکەن بەجۆرێک کە دەبێتە هۆیی ئازاری خۆیی و خەلکی تر کە دەکرێت بلێن ئەمە بەکار هێنانێکی هەلەو زیان بەخشە بۆ مرۆڤ.